لە ژێرسێبەری

# قورئاندا




في ظلال القرآن

کورتەی چەند سەرنجێکە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز

﴿جوزئی (عم ــ ٣٠)﴾


بە پێنووسی

سەید قوتب

گۆڕینی بۆ کوردی

شیروان عەبدولڕەحمان



١٤٢٩ک -- ٢٠٠٨ز

## له ژێر سـێبەری

# قورئاندا

کورتەی چەند سەرنجێکە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز

{ جوزئی ( عم ـ ٣٠ ) }

بە پێنوسی

## سەید قوتب

کۆڕینی بۆ کوردی

شیروان عەبدولڕەحمان

١٤٢٩ك ٢٠٠٨ز

پێناسی کتێب

ناوی کتێب : له ژێر سێبەری قورئاندا
نووسینی : سەید قوتب
وەرگێڕانی : شیروان عەبدولڕەحمان
دیـــزاین : نورالدین عبداللّه
دارشتنی بەرگ : ( گوڵ ) بۆ خزمەتگوزاری چاپەمەنی
تیـــــراژ : ۲۰۰۰ دانه
سەرپەرشتی چاپ : نەهرۆ مەحموود
چـــــاپ : یەکەم

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (۹۲۷)ساڵی (۲۰۰۷) دراوەتێ



له بڵاوکراوەکانی
کتێبخانەی مەحوی
هەولێر - بازاڕی ڕۆشنبیری

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## وتەیەکی پێویست ....

به مەبەستی بەشداریکردن لە خزمەتکردنی کەلتورو هزری کوردی و به پشت بەستن به کەلتوری جیهانی ، به باشمزانی شاکاری یەکێك لە کەڵە پیاوانی مێژووی نوێی مرۆڤایەتی بکەمە دەسپێك و هەنگاوێك بنێم لەم بوارەدا ، ئەویش بە کورتکردنەوەی ئەم بەرهەمە جیهانیە کە بە زمانی عەرەبی نوسراوەو لەبەر گرنگی و تۆکمەیی بەرهەمەکە وەرگێردراوەتە سەر چەندین زمانی زیندووی جیهانی ، وەك : ئینگلیزی ، تورکی ، فارسی ، ئوردی ... هتد

ئاشکراشه کە پرۆسەی بە کوردیکردنی بەرهەمە جیهانیەکان وا چاکترە شاکارەکان لەخۆبگرێت نەك بەرهەمی بوارتەسك و لاواز کە هەر بە فیڕۆدانی کات و توانا نەبێ هیچی تری لێ چاوەڕوان ناکرێت !

ئەم شاکارەی بەردەستتان بەناوی ( لە ژێر سێبەری قورئاندا ) یە کە بە پێنوسی بیریارو ئەدیبی بە ناوبانگی میسری مامۆستای خوا لێخۆشبوو ( سەید قوتب ) نوسراوەو بریتیە لە سەرنج و تێبینیەکانی خۆی دەربارەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەبێ ئەوەی ناوی بنێت تەفسیری قورئان ، بەڵام لەناو خوێنەرانیدا هەر بە( تەفسیری فی ظلال ) ناسراوە .. واشئەزانم ئەم پیاوە زۆر لەوە بەناوبانگترە من لەم سەرەتایەدا بەخوێنەری رێزداری

بناسێنم * .. ئەوەندە نەبێت کە بڵێم زۆر دڵسۆزی ئەو ڕێبازەی بوە کە هەڵبژاردبوو بۆ بەرنامەی ژیانی خۆی و بەهەموو توانایەوە لە خزمەتیدابوو ، تا گیانی خۆشی کردە قوربانی ئەو ڕێبازە ، بۆیە بەرهەمەکانی زیندوون و بۆ چەند نەوەیەکی داهاتووش ئەبنە سەرچاوەو توێشووی فیکری و نموونەی بەرزی دڵسۆزی و خواویستی لە ژیاندا ...

* * *

* بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە ژیاننامەو زانیاری پتر لە مەڕ بەرهەم و تواناکانی ئەم نوسەرە بڕوانە کتێبی زۆر بە پێزو گشتگیری توێژەرو نوسەر : سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی ، بەناوی ( سید قطب من المیلاد الی الأستشهاد ) .. ئەم کتێبە لە لایەن ڕێزدار ( ڕزگار کریم ) کراوە بەکوردی .

# پێشەکی *

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ژیـان لـە ژێـر سـێبەری قورئانـدا بەهرەیـە ، بەهرەیەکـە ئـەوەی نـەی چێشتبێت نایزانێ ، بەهرەیەکە تەمەن بڵندو خاوێن و پیرۆز دەکاتەوە.

سوپاس بۆ خوای گەورە کە وای بۆ رەخساندم ماوەیەك لە ژێر سـێبەری قورئانـدا بـژیم .. لـەو ماوەیـەدا ئەوەنـدەی مـن تاموچـێژم لـە نیعمـەت و بـەهرەکانی خـوای پـەروەردگار چێـشت هـەرگیز لەژیانمـدا بـەو جـۆرە نـەم چێشتبوو . لەو ماوەیـەدا گـوێم لـە خـوای باڵادەسـت ئـەبوو کـە چـۆن بـەم قورئانە لەگەڵمدا ئەدوا .. منی بەندەیەکی لاوازو بێدەسەلات .. ! ئای ئەوە چ رێزلێنـان و بـەها بەخـشینێکە بـەم مرۆڤـە ؟ چ پیرۆزیەکـە بـۆ تەمـەن و بـۆ ژیان؟

لـەژێر سـێبەری قورئانـدا ژیـام و لـە بڵندیـەوە ئـەم روانیـە ئـەو نەفامی و سـەرگەردانیەی مرۆڤایـەتی تێـی کـەوتوەو ئەمروانیـە ئـەو ئاسـتە ساوایەی هەیەتی لە گرنگیدان بە بەها نزمەکان و خۆبەشتزانینیشیان کاتێ کە دەبنـە خـاوەن زانیاریـەکی سـاکار دەربـارەی شـتەکانی دەورویـشتیان ، یـاخود بۆچـوونی منالانـەیان لەمـەڕ راسـتی و دیاردەکـانی ژیـان .. ئینجـا لـەخۆم ئەپرسی : باشە ئەبێ بۆ وایان بەسەرهاتبێت ؟ بۆ وا کەوتونەتە ئەو زەلکاوە

---

* ئەم پێشەکیە لە سەرەتای جوزئی یەکەمدا هاتوە ، بەلام لەبەر بە پێزی و پڕمانایی بابەتەکەی پێم باش بـوو خوێنەری هێژا لەم جوزئەدا بە کورتەیەکی ئاشنا بێت ..

ڕەشەی ژیانەوە ؟ ئەی بۆ گوێناگرن لەو بانگەوازە پیرۆزو بڵندەی خوای پەروەردگاریان ؟ ئەو بانگەوازەی تەمەن پیرۆزو بڵندو خاوێن دەکاتەوە ؟

هەر لە ژێر سێبەری قورئاندا ژیام و بیرم لەو بۆچوونە گشتگیرو تەواوو تێروتەسەلە ئەکردەوە کە هەیەتی دەربارەی بوونەوەرو مەبەستی بوونی بونەوەران لەم گەردوونەدا .. لەهەمان کاتدا ئەو بۆچوونە ساکارو نزمانەم پێ بەراورد ئەکرد کە مرۆڤایەتی تیایاندا دەژی .. پاشان لە خۆم ئەپرسی : باشە ئەم مرۆڤایەتیە چۆن ئەتوانێت لەو زەلکاوە خەستەدا بژی ؟ چۆن لەو ئاستە نزم و تاریکیە ئەنگوستەچاوەدا ئەژی ، کە لە نزیکیەوە ئەو گۆڕەپانە فراوان و ئەو ئاسۆ تەخت و ئەو ڕۆشنایی و روناکیە بەربلاوەی هەبێت ؟

لە ژێر سێبەری قورئاندا ژیام و بوونەوەرم زۆر گەورەتر ئەبینی لەو رواڵەتەی کە لە بەرچاومانە .. ئەمبینی بریتیە لە هەردوو ژیانی دیارونادیار.. ژیانی سەرزەوی و ژیانی ڕۆژی دواییشە ، نەك هەر ئەم دنیایە بە تەنیا .. مردنیش کۆتایی کاروانی ژیانی مرۆڤ نیە ، بەڵکو قۆناغێکی کاروانەکەیە .. ئەوەی لەم ژیانەیدا دەستی ناکەوێت لە ڕۆژی دواییدا دەیدرێتێ ، چونکە لەوێ نەستەمکردن هەیە نە مافخوران .

هەر لە ژێر سێبەری قورئاندا ژیام و ئەمبینی بەهای مرۆڤ زۆر گەورەترە لەهەر ئاست و پلەیەکی تری کە لەوەو پێش یا لەمەودواش دەستی دەکەوێت .. ئەو بە هەناسەیەکی پاکی خوای بالادەست بوە بەم ئادەمیزادە: (فإذا سويته ونفخت فيه من روحي فقعوا له ساجدين) ( گەر دروستم کردو لە گیانی خۆم فووم پیاکرد ئەوا هەموو سوژدەی بۆببەن ).. هەربەو هەناسەیەش کرا بە جێنشینی خوای پەروەردگار لە سەرزەوی : ( وإذ قال ربك للملائكة : إني جاعل في الأرض خليفة ) ( کاتێ کە خوای پەروەردگارت بە

فریشتەکانی فەرموو : وا من لەسەر زەویدا جێنشینێکم دانا ) .. ئیتر بۆ ئەو مەبەستەش سەرجەم بونەوەرانی سەرزەویم بۆ ژێردەستەکردوەو ئەتوانیٚ بەکاریانبێنێت : ( وسخر لكم ما في الأرض جميعا ) ( ئەوەی لە سەر زەویدا هەیە هەر هەموویم بۆ ژێردەستەکردوون ) .. وە لەبەر ئەم رێزلێنانە بیٚ وێنەو ئەم ئاستە بڵندە خوای گەورە وایکردوە تەنها پەیوەندیەکی راست و بڵند کە ئەم مرۆڤایەتیەی لەسەر کۆببێتەوە ئەبیٚ ئەو پەیوەندیە بێت کە راستەوخۆ لەو هەناسە پاکە پیرۆزەوە سەری هەڵدابێت ، ئەویش پەیوەندی باوەڕبوونی پتەوی بیٚ گرێیە بە خوای گەورەو باڵادەست .. چونکە هەر بیرو باوەڕوعەقیدەیە کە بۆ مرۆڤی موسوڵمان ئەبێت بە نیشتمانی و نەتەوەو خزم و کەسوکاریشی .. هەر بۆیە پێویستە مرۆڤایەتیش هەموو تەنها لە سەر ئەو بنچینەیە یەکگرن و کۆببنەوە ، نەك لەسەر ئەو بنەمایانە کۆببنەوە کە گیانلەبەران لەدەوری کۆ ئەبنەوە وەك : خواردن و لەوەڕو لەوەڕگاو مێگەل و شوراو سنوور ! ..

هەروەها زانیم کە باوان و پشتی مرۆڤی موسوڵمان بە قوڵایی مێژوودا رۆچوەو ، ئەو یەکێکە لەو کاروانە پیرۆزەی دەستەیەك لە پیاوان و سەروەرانی پاك و بڵند سەروەریی دەکەن : نوح و ئیبراهیم و ئیسماعیل و ، ئیسحاق و یەعقوب و یوسف و، موساو عیسا و موحەمەد .. درودو سەلامی خوایان لێبێت .. ( وإن هذه أمتكم أمة واحدة وأنا ربكم فاتقون ) ( هەر ئا ئەمە بە تەنها نەتەوەکەتانەو منیش پەروەردگارتانم و جا ئیتر خوا بپەرستن و لیٚی بترسن ) ..

زانیشم کە ئەم کاروانە پیرۆزە ــ هەروەك لەژێر سێبەری قورئاندا ڕووندەبێتەوە ــ هەمان هەڵوێست و هەمان تەنگژەو هەمان ئەزموونیان

دێتـەڕێ ، بـا کـات و شـوێن و سـەردەم و ڕۆژگـارو نەتـەوەکانیش بگـۆڕێن و لەیـەك نەچـن .. هـەر هـەموویان بـەرەنگاری گـومڕایی و سەرلێـشێوان و ملهـوڕی و ئارەزووپەرسـتی و سـتەم و ئـازاردان و هەڕەشـەو دەربـەدەری بوونەتەوە .. بەڵام مرۆڤی موسوڵمان بە هـەنگاوێکی چەسپاوو ویـژدانێکی ئاسودەو دڵنیـا لـە سـەرکەوتنی خواییەوە بەردەوامـەو چاوی لـە بەخششی ئـەوەو وایـدادەنێ کـە لەهـەر سـاتێکدا بـەڵێنی خـوای میهرەبـان دێتـەدی و سەرکەوتن بەدەست دێنن : ( وقال الذين كفروا لرسلهم لنخرجنكم من أرضنا او لتعودن في ملتنا . فأوحى إليهم ربهم لنهلكن الظالمين ، ولنسكننكم الأرض من بعدهم . ذلك لمن خاف مقامي وخاف وعيد ) ( بێ باوەڕان بە پێغەمبەرەکانیان ئەوت : یا لە خاکی خۆمان دەرتاندەکەین یاخود ئەگەڕێنەوە ناو کۆمەڵگای ئێمە . خوای پەروەردگاریش هـەواڵی ئـەوەی دانـێ کـە سـتەمکاران لەناو دەبـەین و دواتریش لە خاك و زەوی ئەواندا جێنشینتان دەکەین ، ئـەم پاداشـتەش بـۆ ئەوانەیە کە لە پلەو پایەی من ئەترسن و لـە سـزای سـەختی ڕۆژی دوایـیش سڵئەکەنەوە ) .. .

پاشانیش هەر لە ژێر سێبەری قورئاندا بە دڵودەرونێکی هێمن و هەست و نەستێکی ئارام و بە ویژدانێکی ئاسـوودە وە ژیـام .. وا ئـەژیام کە دەسـتی توانای خوای پەروەردگارم لە هەموو ڕووداوو لـە هـەموو شـتێکدا ئـەبینی . لە پەنای خواو لە سایەی ئەودا ئـەژیام ، هەسـتم بـە سـیفەتە بـەرزو جـوان و کاراکانی ئەکرد .. زانیم کە ئەم بوونەوەرە بێ خاوەن نیەو هـەروا نەدراوەتـە دەسـت چـەند یاسـایەکی مەیکانیکـی کوێـری کـەڕولاڵ . بەڵکـو لـە پـشت هەموو یاسا گـەردوونیەکانەوە ویـست و دەسەڵاتـێکی بـاڵای ڕەهـا هەیـە .. خـوای باڵادەسـتیش بـە ویـست و ئـارەزوی خـۆی چـی بوێـت ئـەیکاو چـی

بەدیبهێنێت بەدیئەهێنێ و سنوور بۆ تواناو دەسەڵات و ویستی باڵای ئەو نیە ..

ئەوەش فێربووم کە بەرنامەی خوا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دانراوەو خوا هەرخۆی ئەزانێت کەی و چۆن و چەند بەش لەو بەرنامەیەی ئەداتە دەست کێ و چۆن جێبەجێی بکەن ، کات دیاریکراو نیەو رۆژگار بەربڵاوەو بە تەمەنی کەسێك کۆتایی نایەت کە خەمی ئەوەیەتی تا لە ژیان ماوە ئامانجەکانی نەیەنە دی ، هەروەك ئاکاری خاوەن بەرنامە دونیاییەکان کە هەموو هیواو ئاوات و بەرنامەی ژیانیان لە تەنها نەوەیەکدا گیرخواردوو ئەکەن و ئەترسن مەرگ کۆتایی بە ئاواتە کورتەکانیان بهێنێت ! هەر بۆیە لەوپێناوەشدا قۆناغەکان کورت ئەکەنەوەو هەنگاوی کورتتر ئەنێن و ئامادەشن بەسەر لاشەو کەللەسەری کەسانی تردا هەنگاو بنێن و خوێنی بێگوناهان برژێن ، تەنها بە مەبەستی گەیشتن بە ئاوات و ئامانجە کرچ و کاڵ و سەقەت و نەبەکامەکانیان . کە هەرگیز لە گەڵ رەوشت و فیترەی پاکی ئادەمیزاددا ناگونجێ .. بەڵام بەرنامەی خوا کە ئاینی ئیسلامە هێدی هێدی لەگەڵ سروشت و فیترەی مرۆڤدا دەرواو زۆری لێناکاو هەنگاو بەسەر راستیەکاندا نانێ و لە هەموولایەکەوە ئاگای لێیەتی و چاودێری ئەکاو ئارامی لەسەردەگرێت ، تا ئەیگەیێنێتە ئەو ئامانجەی خوای پەروەردگاری بۆی دیاریکردوە .. ئەوەشی لەم قۆناغەدا نەهاتەدی لە قۆناغی دواتر یا دواتردا با بێتە دی ، یا تا ئەوکاتەی خوای بەدیهێنەری مەبەستێتی و ئەیهێنێتە دی .

گەڕانەوەش بۆلای خوا ــ وەك لەژێر سێبەری قورئاندا دەردەکەوێت ــ تەنها یەك شێوازی هەیە ، هەر ئەوەو هیچی تر ، ئەویش گەڕانەوەی ژیانە

بەهـەموو لایەنەکانیـەوە بـەرەو ئـەو بەرنامەیـەی خـوای گـەورە لـە کتێبـە پیرۆزەکەیدا دایڕشتوە بۆ مرۆڤایـەتی .. کە ئەبێ سەروەری بۆ ئەم کتێبە بێـت لـە ژیـانی مرۆڤـدا ، ئەگـەرنا بـەدکاری و خراپەکاریـەکی بـێ سـنوور سـەرزەوی داگیردەکـاو ژیـان سـەرتاپا ئەشـڵەژێ و کارەکـان لـە گرێژنـە دەرئەچن و گومڕایی و سەرگەردانی بە هەموولایەکدا بڵاو ئەبێتەوەو لە بری یەکخواپەرستی ئارەزووپەرستی جێی ئەگرێتەوە ، کە ئەمـەیان سەرچاوەی سەرجەم ستەم و بەدڕەفتاریو ملهوڕیو ئازارو ئەشکەنجەکانی مرۆڤایەتیە لە هەموو کاتوسات و رۆژگارو سەردەمێکدا ..

هەر بۆیە بەلادانی بەرنامەی ئیسلام لە سەروەریکردنی کاروانی ژیانی مرۆڤایـەتی رووداوێکـی جـەرگبڕو نەهامەتیـەکی ئێجگـار گـەورەبوو کـە ئادەمیزاد تووشـی هاتبێـت بـە درێـژایی تەمـەنی .. لـە کاتێکدا کـە ئیسلام جڵـەوی سـەرکردایەتی گرتەدەسـت سـەرزەوی تێکـڕا ئەیناڵانـد بەدەسـت گەنـدەڵی و خراپەکاریـەوە ، سـەرکردە بـوودەڵ و گەنـدەکان سـەریان لـە خـەڵکی شـێواندبوو ، لـە هـەموو لایەکـەوە ئـاگری دووبـەرەکی و جـەنگ و شەڕشۆڕ هەڵدەستا : ( ظهر الفساد في البر والبحر بما كسبت أيدي الناس ) ..
( بەدکاری لە سەرزەوی و لە ناو دەریاکانیشدا سەری هەڵداوە لـە ئەنجامی کاروکردەوەکانی خەڵکیی ) ..

ئـاینی ئیـسلام بـەم قورئانـە بـەرزە سـەرکردایەتی گرتـە دەسـت ، بـەو بۆچوونە نوێیەی کە قورئان هێنایە ئاراوە ، بەو یاساو شەریعەتەی کە لـەم بۆچـوونە نوێیـەوە سەرچـاوەی گرتبـوو ، بۆیـە ئەمـە بـۆ ئـادەمیزاد بـوە لەدایکبوونێکی نـوێ کە لـە راستیدا زۆر لـە لەدایکبوونەکـەی یەکـەمجاری مـەزنترو گـەورەتر بـوو .. بـەڵام ئـەوە بـوو ئـەو هەرەسـهێنانە پشتـشکێنە

روویـداو ئیـسلام لـه سـەرکردایەتی دوورخرایـەوەو بەرنامـەو یاسـاکانی ئارەزووپەرستی و نەفامیی جارێکی ترو بە شێوەیەك لە شێوە زۆرەکانی ، کە شێوەی بیرو بۆچوونی ساکارو ئاست نزمـی ماددیەتـە ، سەرکردایەتی گرتەدەست ..

ئێـستاش ئاشـکرایە کـە دەسـتیەك ملـهوڕو ڕێگـری بلیمـەتی فێڵـزان و دوژمنـی مرۆڤایـەتی ، بەرنامـەو ئـاینی خـوای گـەورەی بـۆ ئەخەنـە تـای تەرازوویەك و بەدەستهێنان و پێشکەوتنە مرۆییـەکانی جیهانی مـاددی بـۆ ئەخەنـە تاکـەی تـری تەرازووەکـەوە ، ئینجـا پێـی ئـەڵێن : هەڵبـژێرە !!! یـا بەرنامەی خوا بۆ ژیانی خۆت هەڵبژێرەو ئیتر ئەبێ پشت بکەینە هەموو ئەو دەسـتکەوت و بەرهەمانـەی لـە جیهـانی مادديـاتـا مرۆڤـ بەدەسـتی هێنـاون ، یاخود بەرهەم و دەستکەوتەکانی جیهانی زانیاری و تەکنەلۆجیا هەڵبژێرەو نابێ چیتر ڕووبکەیتە بەرنامەو شـەریعەتی خـوا !!!! کـە ئەمـەش فریـودان و هەڵخەڵەتانـدنێکی نەگریس و شـەیتانانەیە ، چـونکە کێـشەکە هـەرگیز بـەو شێوەیە نیـە .. بێگومـان بەرنامـەی خـوا هـەرگیز دوژمنـی دەسـتکەوتەکان و بەدیهێنانی مرۆڤایەتی نیە ، بەڵکو ئەو خۆی سەرچاوەی ئەو بەدیهێنانەیەو خۆی ئاڕاستەی لەباروگونجاوی بـۆ دائـەنێت و هـانی ئـەدات ، بـۆ ئـەوەی بـە باشترین شێوە ئەرکی جێنشینی لەم سەرزەویەدا بە جـێ بگەیـەنێ و سـوود لـەو هـەموو ئاسـانکاریو بـەروبوم و پێکهاتانـەی زەوی ببینێـت کـە خـوای باڵادەست بۆی ژێردەستەکردوە ..

شەریعەتی خوا بۆ خەڵکی چمکێکە لـە یاسـا گشتیەکەی سەرجەم ئەم گەردوونـە ، وە پیـادەکردنی ئـەم یاسـاو شـەریعەتە هەرئـەبێ کاریگەریـەکی باشـی هـەبێت بـۆ سـەر گونجانـدنی ڕەوتـی خـەڵکیی و ڕەوتـی گـەردوون ..

شـەریعەتیش بەرهـەمی بیروبـاوەڕو ئیمانـە ، کـە بـەبێ بنـچینەو بناغـە گەورەکەی ناکەوێتە سەرپێ ، ئەو بۆ ئەوە دانراوە کە لە نێو کۆمەڵگایـەکی موسـوڵماندا پیادەبکرێـت ، هـەروەها بەشـداریش بکـات لـە بنیاتنـانی کۆمەڵگای موسوڵمان . کە تەواوکەری بۆچوونەکانی ئیسلامە بۆ هەریـەك لـە بوونـەوەری گـەورەو بـوونی مرۆڤایـەتیش ، هاوشـان لەگـەڵ ئـەوەی ئـەم بۆچوونە دروستی دەکات لە ترسی خوا لە ویژداندا و ، خاوێنی لە هەست و نەسـتدا و ، گـەورەیی و بـەهاداری ئامانجـەکان و ، بڵنـدی وجـوامێری لـە ئاکارو خووڕەوشـتدا .. بەو پێیە گونجان و تەواوکاریـەکی جوان و ڕەسـەن دەرئەکەوێت لە یاساکانی خوای گەورەدا ، چ ئەوانەی پێیـان ئەڵێن یاسـا سروشـتیەکان یـاخود ئەوانـەی پێیـان ئـەڵێن بـەها ئیمانیـەکان .. کـە هـەر هـەموویان چـمکانێکن لـە یاسـا گـشتیەکەی خـوای بالآدەسـت بـۆ ئـەم بوونەوەرە..

ئەوانـە چـەند سـەرنج و تێبینیـەك بـوون لـە ماوەی ژیـانی ژێـر سێبەری قورئانـدا ، ئاواتـەخوازم خـوای گـەورە بیکاتـە مایـەی سـوودو ڕێنمـایی ... وما تشاءون إلا أن يشاء الله .. ( هیچ کارێکیش بە ویستی ئێوە نابێت مەگەر خوای گەورە خۆی ویست و ئارەزووی لەسەر بێت ) ..

*	*	*

## خوێنەری هێژا ...

بۆ خوێندنەوەی ئەم بەرهەمە تکایە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکە :

١ – مانای ئایەتەکان بەهاتنی ئەم دوو خاڵە ( .. ) کۆتایی دێت ، ئەوانی دی سەرنج و بۆچوونەکانی نوسەر خۆیەتی دەربارەیان ..

٢ – هەر فەرموودەیەکی پێغەمبەر ( ﷺ ) لێرەدا هاتبێت ، (ساغکردنەوەی) یانی ( تخریجەکەی ) لە سەرچاوەکەدا کراوە ..

## سورەتی ( النبأ )

## مەككیە .... چل ئایەتە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ) .. خوای گەورە خۆی پرسیار ئەكاو ئەفەرموێ : ئەرێ ئەوانە باسی چی ئەكەن ؟ .. دیار بوو كە بێ باوەڕان خەریكی باسكردنی رۆژی دوایی بوون و مشتومڕیان بوو لەسەر راستیی زیندوبوونەوە .

( عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ ) .. هەر خۆشی وەلاّم ئەداتەوەو ئەفەرموێ : باسی ئەو هەواڵ و كارەساتە زۆر گەورەو گرنكە دەكەن !

( ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ مُخۡتَلِفُونَ ) .. ئەو هەواڵەی كە هێشتا باش باوەڕیان پێی نیەو دانی پیانانێن !

( كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ ) .. نەخێر ! هەرئەبێ بزانن .

( ثُمَّ كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ ) .. دیسانەوە نەخێر ! هەرئەبێ بزانن .. لێرەدا وا دەردەكەوێ كە خوای بالاّدەست زۆر لێیان تووڕەیە ، بۆیە ئەو نەخێرەیان لێ دووبارە دەكاتەوە !

( أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ مِهَٰدٗا ) .. ئەی هەر ئێمە نین ئەو زەویە رەقەمان بۆ تەخت و ساناكردون تا لەسەری بحەوێنەوە و ژیانی تیابەبەنەسەر؟ .. كە گەر تەنها یەك پێكهاتەی بە رێژەیەكی زۆر كەمیش بگۆڕێت ئەوا ژیان لەسەر زەوی مەحاڵ ئەبێت و شیرازەی هەموو شتێك تێكدەچێت !

( وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ) .. چیاو کێوەکانیشمان کردوّتە میّخ و هاوسەنگیی زەویمان پیّ راگرتوە ؟

( وَخَلَقۡنَٰكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ) .. ئەی ئێوەشمان بە جووتی نێرومیّ ( یا خود ژن و پیاو ) دروست نەکردوە ؟ .. گەر ئەو جیاوازیە لە رەگەزدا نەبوایە نەوەی مروّڤایەتی بەردەوام نەدەبوو .

( وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا ) .. نوستنمان بوّ کردونەتە مایەی حەوانەوەی پاش ماندووبونتان کاتیّ خەریکی دابینکردنی بژێوی ژیانتانن .. کە نهێنی خەوتن خوای پەروەردگار خوّی نەبیّ کەس نایزانیّ و هەرلەو ساتانەشدا مروّڤ نە زیندوەو نەمردوو !

( وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِبَاسٗا ) .. شەوگاریش وەك بەرگێك ئەکەین بەبەر زەویداو بێدەنگی و خاموّشی باڵ ئەکێشێت بەسەر هەموو شتێکدا .

( وَجَعَلۡنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشٗا ) .. روّژگاریشمان تەرخان کردوە بوّ هەوڵدان و کوّشش و ماندووبون لە پێناو دابینکردنی بژێوی ژیان و ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی .

( وَبَنَيۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعٗا شِدَادٗا ) .. لە سەروشتانەوە حەوت پێکهاتەی زوّر توندو فراوانمان بوّدروستکردوون .. لەوانەیە مەبەست لە هەر حەوت چینەکەی ئاسمان بێت یاخود حەوت کوّمەڵە هەسارە زەبەلاحەکان بن کە خوای گەورە خوّی نەبیّ کەس نازانیّ چیەو هیچ کەسیش نهێنیان نازانیّ .

( وَجَعَلۡنَا سِرَاجٗا وَهَّاجٗا ) .. روناکیەکی پرشنگداریشمان بوّ داناون کە

سەرچاوەی ژیانە بۆ زەوی و سەرجەم بوونەوەرەکانی سەرزەویش .. مەبست لە روناکی و گەرمایی ئەو رۆژە درەوشاوەی ناو ئاسمانە

( وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ) .. هەر لەو ئاسمانەشەوە هەورمان پەیدا کردوەو بەخوڕ ئاویان لێدێنینە خوارێ بۆتان .. کە بە چەند هۆکارێك دەگوشرێن و بارانیان لێدێتە خوارێ

( إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَٰتًا ) .. جا بۆ دادوەری لە نێوان خەڵکیدا رۆژی دواییمان داناوەو لەکاتوساتی دیاریکراوی خۆیدا ئەیبینن .. کە تیایدا باوەڕداران و کاربەجێیان پاداشتی خۆیان وەردەگرن و گومڕایان و ملهوڕان و زۆرداران و بەدکارانیش تووشی سزای سەختی خۆیان دەبنەوە .

( يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ) .. هەر لەو رۆژەدایە کە فوودەکرێت بە (صور) دا و سەرجەم ئادەمیزاد لەودەنگە مەزنە رادەپەڕن و پۆل پۆل دەهێنرێنە بەر بارەگای خوای بالادەست بۆ لێپرسینەوەی کۆتایی .

( وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ) .. هەر لەو رۆژەشدایە کە ئەو ئاسمانە توندو تۆڵانە لێکهەڵدەوەشێنەوەو چەندین دەلاقەی تێدەکەوێ و شێوەیان دەگۆڕێ !

( وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ) .. چیاو کێوەکانیش لەبن هەڵدەکەنرێن و بەو ئاسمانانەداو بەدەم باوە پەرش و بلاو ئەکرێنەوەو وەکو خۆیان نامێنن و هەروەك سەرابێکیان لێدێت ! .. ئای ئەبێ ئەو دیمەنانە چەند سامناك و تۆقێنەربن !!

﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴾ .. **خۆ ئاگری سەختی جەهەنەمیش لەمێژە لە چاوەڕواندایە بۆ ئەشکەنجەدانی ئەو یاخیبوە بێ باوەڕانە .**

﴿ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا ﴾ .. **ئەو ئاگرە ئەبێتە مۆڵگەو خانەی حەوانەوە بۆ ملهوڕان و ستەمکاران !!**

﴿ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴾ .. **کە ئەبێ قۆناغ دوای قۆناغ تیا بمێننەوەو قوتاربوونیان نیەو بەجێی ناهێڵن .**

﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴾ .. **لەو جێگا زۆر گەرم و ئاگراویەیاندا نە بایەکی فینك لێیان ئەدات و نە خواردنەوەیەکی خۆش ئەچێژن .**

﴿ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴾ .. **خواردنەوەیان تەنها بریتیە لە ئاوی گەرم وکوڵاتوو لەگەڵ کێماوی برینەکانیان کە هەردەم تەڕەو هەرگیز سارێژنابێت .**

﴿ جَزَآءً وِفَاقًا ﴾ .. **دە بخۆنەوە ، ئەوەیە پاداشتی تەواوو پڕ بەپێستی ئەو بەدکاری و گومڕایی و ستەمکاریەی لە ژیانتانا ئەنجامتان دابوو .**

﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴾ .. **ئەو سەر لێشێواوو بێ ئاگایانە وایان دانەنابوو کە تووشی ڕۆژێکی ئاوا ئەبنەوەو ئەم ڕۆژە ڕەشە چاوەڕێیان دەکات .**

﴿ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابًا ﴾ .. **زۆر بێ شەرمانە و بوێرانە بەڵگەو ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ ئەخستەوەو پشتگوێیان خستبوو .**

﴿ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ كِتَٰبًا ﴾ .. **ئیتر ئێمە هەموو شتێکمان ئاگا لێیەو**

هەموویمان هەژمارکردوەو وا تۆمارکراون کە کەس ناتوانێ بیانگۆڕێت .

( فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ) .. کەواتــه بــچێژن ، بخــۆن ئــازارو ئەشکەنجەی بەردەوام ، کە هەر زیاترو زیاترتان دەرخوارد ئەدەین و بۆ تاکە ساتێکیش سزاو ئەشکەنجەتان لەسەر سووك ناکەین .

( إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ) .. بــەڵام بــۆ بــڕواداران و ئەوانــەی لــەخوا ئەترســان ، پاداشت و بەهرەی نازدارو بێ وێنەمان ئامادەکردوەو پێشکەشیان ئەکەین .

( حَدَآئِقَ وَأَعْنَـٰبًا ) .. وەك بــاخ و بێــستانی رازاوەو رەزی مێــوو ترێــی نــاو بەهەشت .

( وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ) .. هەروەها کەنیزەو کیژۆڵەی ناسك و نازداری سنگ پــڕو هاوتەمەن .

( وَكَأْسًا دِهَاقًا ) .. وەك پەرداخی پڕی لێواولێو لە خواردنەوەی زۆر بەتام و بە چێژ .

( لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ) .. هــەروەها گوێبیــستی هــیچ شــتێکی وانــابن کــە بێزاریــان بکــات یــا درۆودەلەســەو قــسەی هەلەقومەلــەق و بــێ سوودبێت .

( جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ) .. ئەمانە هەمووی پاداشتێکن لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆیــان تــەرخانکراوەو وەك بەخششێکی دیاریکراو خــەڵاتیان ئــەکات .. ئــەو پــەروەردگارە هەرچــەندە زۆربەخــشندەیە بــەڵام دواڕۆژی پیاوچــاکان و بــەدکارانی وەك یــەك لێ نــەکردوەو هەریەکــە بــە پێــی کــردەوەو

ئاكاری خۆیان رەفتاریان لەگەڵدا دەكات .

( رَّبِّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَـٰنِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ) .. ئەو خوایەی پەروەردگاری زەوی و هەموو ئاسمانەكان و ئەو جیهانە نادیارەی كە لە نێوانیشیاندایە ، كەسیش بۆی نیە و ناشتوانێ بە ئارەزووی خۆی قسەبكاو هەڵبداتێ ..

( يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ صَفًّا ۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ) .. ئەو رۆژوساتەی كە ( الروح ) یانی جوبریل ــ سەلامی خوای لێبێت ــ وە سەرجەم فریشتەكان بەڕیز رادەوەستن و كەس دەنگی لێوەنایەت و هیچ قسەیەك ناكەن مەگەر ئەوانەی كە خوای باڵادەست بە ویستی خۆی رێیان پێ ئەدا ، ئەوانیش ئەبێ تەنها وتەی بەجێ لە زاریان بێتەدەرێ ..

( ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ ) .. ئەو رۆژە هیچ گومانی تیانیەو هاتنەدی بەڵگەنەویستە ..

( فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ) .. جا ئیتر ئەوەی بیەوێت و ئارەزوو بكات بەرەو لای خوای پەروەردگاری خۆی رێ ئەگرێتە بەرو .. بەرنامەو ئایینی ئەو ئەكات بە بەرنامەی ژیانی و چاكە خوازو رەوشت بەرزئەبێت لە هەڵسوكەوتیدا .. كەواتە تا كارلەكارنەترازاوەو كات بەدەستەوەیە هەر مرۆڤێكی ژیرو دانا ئەتوانێت توێشوویەكی باش بۆ خۆی هەڵگرێت كە لە تەنگانەی ئەو رۆژە دژوارە رزگاری بكات .

(إِنَّآ أَنذَرۡنَـٰكُمۡ عَذَابًا قَرِيبًا يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَـٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ) .

**( إِنَّآ أَنذَرۡنَـٰكُمۡ عَذَابًا قَرِيبًا ) .. ئەوە ئێمە ئاگادارتان ئەکەینەوە کە سزاو ئەشکەنجەو دواڕۆژێکی سەخت و ناهەموار چاوەڕێتانەو زۆر دوورنیە لێتانەوە .. تەمەنیشتان لەم سەرزەویەدا زور درێژ نیە !**

**( يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ ) .. هەر لەو رۆژەشدایە کە هەموو کەسێك ئەڕوانێتە ئەو کاروکردەوانەی لە ژیانیدا ئەنجامیداون و رەفتاری پێکردوون و ئەو رێبازو بیرو باوەڕەش کە پەیڕەوی کردبوو .**

**( وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَـٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ) .. بێ باوەڕان و شوێنکەوتوانی هەواو ئارەزووش پەشیمانن و ئەڵێن بریا سەد بریا هەر دروست نەبوینایەو هەرخاك وخوڵ بووینایەو نەبووینایە بە ئادەمیزاد !! .. جا ئەبێ ئەو رۆژە چ رۆژێك بێ کە وا لەو جۆرە کەسانە بکات ئەو ئاواتە پڕ نائومێدی و بێ ورەیی و رووخاویە بخوازن ...!!**

*    *    *

سورەتی ( النازعات )

مەککیە .... چل و شەش ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

لەسەرەتای ئەم سورەتەدا خوای بالأدەست سوێند بە هەندێ لە بوونەوەرەکانی خۆی دەخوات و ئەفەرموێ :

( وَٱلنَّـٰزِعَـٰتِ غَرۡقًا ) .. لەوانەیە مەبەست لەو فریشتانە بێت کە گیانی ئادەمیزاد زۆر بە توندی ریشەکێش دەکەن و لاشەیەکی مردووی بۆ بەجێ دێڵن . یا مەبەست لەو ئەستێرانەیە کە لە خولگەکانیاندا بێ وچان و بەردەوام ئەسورێنەوە .

( وَٱلنَّـٰشِطَـٰتِ نَشۡطًا ) .. ئەو فریشتانەن کە زۆر گورج وچالاکن لە کارەکانیاندا . یا ئەو ئەستێرە چالاکانەن کە لە رێرەوێکەوە ئەکشێن بەرەو رێرەوێکی تر .

( وَٱلسَّـٰبِحَـٰتِ سَبۡحًا ) .. ئەو فریشتە بەرێزانەی لە ئاسمانە فراوانەکاندا ئازادانە بەرەو ژوور هەڵدەکشێن . یا ئەو ئەستێرانەی لە ئاسمانەکانی پەروەردگاریاندا هەڵواسراون و لە خولگەکانی خۆیادا مەلەوانی دەکەن .

( فَٱلسَّـٰبِقَـٰتِ سَبۡقًا ) .. ئەو فریشتە کارایانەی پێشبڕکێیانە بۆ ئەنجامدانی فرمانەکانی خوای پەروەردگاریان . یا ئەو ئەستێرانەی لەکاتی سوڕانەوەیاندا لە خولگەکانیاندا دەڵێی پێشبڕکێ دەکەن .

( فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ) .. ئەو فریشتانەی کارەکانیان بەو پەڕی رێکوپێکی ئەنجام دەدەن و فەرمایشتەکانی خوای مەزن لە کاتوساتی تەواوی خۆیاندا بێ کەم وکوڕی بە جێ ئەگەیەنن . یا ئەو ئەستێرانەی ئەو رۆڵانەی بۆیان دانراوە بە موو لێی لانادەن و رێڕەوی خۆیان بزرناکەن .

( يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ) .. لەو رۆژەی کە زەوی دەهەژێنرێ و سەروبن دەکرێت .. دوای ئەوەی گوێی لە دەنگ و ناڵەی لەرزێنەری فووکردن بە ( صوردا ) دەبێت .

( تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ) .. دوابەدوای زەویش ئاسمانەکان دەهەژێن و لەهەموو لایەکیەوە دەنگی تەقینەوەی مەزن دەبیسترێ و پێکهاتوەکانی لەیەك ئەترازێن و پارچە پارچە دەبن و دەبنە تۆزو با .. دوای ئەوەی دەنگ و ناڵەی لەرزێنەری فووکردن بە (صور ) دا بۆ جاری دووەم دەیان هەژێنێت

( قُلُوبٞ يَوۡمَئِذٖ وَاجِفَةٌ ) .. پاش بینینی ئەم رووداوە تۆقێنەرانە دڵی زۆربەی خەڵکی ئەکەوێتە بارودۆخێکی پڕ لە ترس و لەرزەوەو چاویان ئەپەڕێتە تەوقی سەریان و تووشی دڵە لەرزێیەکی بێ وێنە ئەبن .

( أَبۡصَٰرُهَا خَٰشِعَةٞ ) .. ئەو خەڵکە هەموو سەروچاویان شۆڕەو لە ترسانا ناوێرن سەر بەرز بکەنەوە .

( يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرۡدُودُونَ فِي ٱلۡحَافِرَةِ ) .. لەبەر خۆشیانەوە ئەڵێن : ئەبێ ئێمە لەناو گۆڕ هاتبینەوە دەرێ و دیسان هاتبینەوە سەر دنیا ؟

( أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا نَّخِرَةٗ ) .. چۆن ؟ دوای ئەوەی مردین و گۆشتەکەمان

ڕزی و ئێسکەکانیشمان پووکایەوە ؟

( قَالُواْ تِلۡكَ إِذٗا كَرَّةٌ خَاسِرَةٞ ) .. گەر وابێ ئەوا خاك بەسەرمان و هەر ئێمە دۆڕاوین و دەست بەتاڵ خۆمان !

( فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ ) .. ئیتر بە یەك هاواری گەورەو دڵ لەرزێنی تر هەموو رادەپەڕن و لەناو گۆڕەکانیان هەڵدەسنەوە سەرپێ .

( فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ) .. هەر کە چاویان کردەوە خۆیان لە گۆڕەپانێکی سپی و روناکدا ئەبیننەوە .. کە گۆڕەپانی گردبوونەوەو چاوەڕوانیە تا ساتی لێپرسینەوە دادێت .

( هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ) .. پاشان خوای گەورە دەپرسێ و ئەفەرموێ : ئەی تۆ بەسەرهاتی موسات بیستوە ؟

( إِذۡ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى ) .. لەوکاتەی کە خوای پەروەردگاری لای دۆڵی پیرۆزی ( طوی ) وە بانگی کرد تا فەرمایشتەکانی خۆی پێ ڕاسپێرێت .

( ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ) .. پێی فەرموو : بڕۆ بۆلای فیرعەون ، ئەو فیرعەونەی گومڕاو ملهوڕو ستەمکارە .

( فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ) .. هەر بە نەرمی پێی بڵێ : بۆ نایەی واز لەو ستەمکاریەت بێنی و ڕێگای پاکیی و سەرفرازی و خواناسین بگریتە بەر ؟

( وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ ) .. تا ڕێگای بەرەو خواناسینت پێ بناسێنم و

دڵودەرونت نەرم ببێ و ترسی خوا بکەوێتە دڵتەوەو بۆ یەکجاری رێگای ملهووڕی فەرامۆش بکەیت .

( فَأَرَىٰهُ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ) .. پاشان ئایەت و نیشانە گەورەکەی پیشاندا .. بریتی بوو لەو دارەی دەستی کە ئەبوو بە مارێکی زەبەلاح و دەستیشی ئەخستە گیرفانیەوە کە دەری ئەهێنا روناکیەکی پرشنگداری زۆر جوانی پەخش دەکرد .

( فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ) .. بەڵام ـ ئەو ملهوڕە ـ گوێی نەدایەو بەدرۆی خستەوەو سەرپێچی کرد لە فەرمایشت و بانگەوازەکەی موسا پێغەمبەر .. ئەو هەڵوێستەی فیرعەون وەك هەموو ملهوڕو ستەمکاران کەللەرەقی و بەدڕەفتاری نواندن بوو بەرامبەر ئەو کەسەی دەیەوێت رێنماییان بکات بەرەولای خواو بەرەو سەرفرازی بوون لە دنیاو لە قیامەتیشدا .

( ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ) .. ئیتر فیرعەون پشتی تێکردو کەوتە هەوڵدان بۆ بەدرۆ خستنەوەی ئەو پێغەمبەرە .

( فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ) .. ـ جا بۆ ئەو مەبەستەو لە هەموو لایەکی وڵاتەکەیدا ـ کەوتە جاڕدان بۆ کۆکردنەوەی جەماوەر بە گشتی و جادووگەرە ناودارەکان بە تایبەتی ..

( فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ) .. ئینجا رووی تێکردن و بە هەموو دەنگی ئەم وتە نابەجێیەی پێ راگەیاندن کە : هەر من خوای باڵادەست و پەروەردگاری ئێوەم .. دیارە کاتێ سەرکردەیەکی ملهوڕو ستەمکار ئاوا بێ شەرمانە ئەتوانێ ئەم وتە ترسناکە بڵێت کە دڵنیا بێ لەوەی زۆربەی جەماوەرەکەی

ملکەچ و ئەڵقە لە گوێی سەرکردەکەیانن و هەرچی پیاوەتی و غیرەت هەیە لە دەستیان داوەو خۆیان زۆر بێدەسەلات دێتە بەرچاو لەبەردەم دەسەلاتی ناڕاستەقینەو گەندەی ئەو سەرکردە گەندەڵ و بێ شەرمەدا .

( فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ) .. هەر بۆیە خوای گەورەو بالادەستی زەوی و ئاسمانەکان ئەوەندە لێی تووڕەبوو کە تووشی سزاو ئەشکەنجەیەکی ئێجگار توندو دژواری کرد ، چ لە ڕۆژی دوایی و چ لە ژیانی سەرزەویشیدا .

( إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰٓ ) .. ئەم ڕووداوە ـ لەگەڵ هەڵوێستی خوای مەزن بەرامبەر ئەو ستەمکارانە ـ ئەبێ ببێتە پەندو ئەزمونێك بۆ ئەوانەی لە خوا ئەترسن و پلەو پایەو دەسەلات و توانای خوای پەروەردگاری خۆیان ئەزانن و سنوورەکانی نابەزێنن .

( ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ) .. باشە ، ئایا دروستکردن و بەدیهێنانی ئێوەی ئادەمیزاد ئالۆزترو گرانترە یاخود دروستکردن و بەدیهێنانی ئاسمانەکان ؟ کە زۆر تۆکمەو پڕ لە ئەستێرەوهەسارەی زەبەلاح و بێ وێنە بنیادی ناوە .. دیارە وەلامەکەی بەڵگە نەویستەو هەر ئاسمانەکان گەورەترن لە بنەمای دروستبوون و بەدیهێنانیاندا !

( رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا ) .. کە بەرزو بڵندی کردوەو لەوپەڕی ڕێك وپێکیداو لەسەر دانسقەترین یاسا دایمەزراندوە .

( وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا ) .. شەوو شەوگاریشی زۆر تاریك و نوتەك کردوە و لە بەرامبەریشدا ڕۆژگاری زۆر ڕوناك و ڕۆشن کردوتەوە .

( وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ) ..پاشان سەرزەوی تەخت و ڕێك كردوە بۆ بەكارهێنان و هاتوچۆكردن بەسەریدا .

( أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ) .. هەر لەو زەویە رەق و تۆكمەیە بە فەرمانی خوای گەورە ئاوو سەوزایی دێتەدەرێ و ژێردەستەی مرۆڤ دەبێت بۆ چاندن و سوود لێوەرگرتنیان لە لایەن مرۆڤ خۆی و گیانلەبەرەكانی دەوروپشتیشیەوە .

( وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ) .. چیاو كێوەكانیشی وەك مێخ لەو زەویەدا چەقاندوەو چەسپاندونی بۆ راگرتنی هاوسەنگیی ئەم زەویە .

( مَتَٰعًا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ) .. ئەو شتانەی سەرزەوی هەمووی بۆ سوودو قازانجی ئادەمیزادو ئاژەڵانیشە ، تا بەردەوامیی ژیانیان بپارێزێ‌و رۆڵی خۆیان لەسەر ئەم زەویەدا بە باشترین شێواز پیادە بكەن .

( فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ) .. جا گەر ئەو رووداوە كاولكەرو ماڵوێرانكەرە گەورەو ترسناكە روویدا .. هەموو شتێك رائەماڵێ و هیچ شتێك خۆی لە بەریدا ناگرێ و تێكیاندەشكێنێت ( كە یەكێكە لە دیمەنە ترسناكەكانی رۆژی قیامەت ) .

( يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ) ..ئا لەو كاتوسات و رۆژە پڕ مەترسی و سامناكانەدا ئادەمیزاد باش بەخۆ دیتەوەو هەرچیەكی كردوەو ئەنجامداوە لە ژیانیدا بە بیری دێتەوەو ئاخی پەشیمانی هەڵئەكێشێ .. لە كاتێكدا كە پەشیمانی سودی نیەو جێی هیچ ناگرێت .

( وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ) .. ئینجا جەهەننەم بەو پەڕی ئامادەباشیەوە ئەخرێتە گەڕو ئەوەی چاوساغ و دیدەڕوّشن بێت بە چاوی خوّی ئەیبینیٚ و بوٚ هەمووان نمایشدەکرێت .

( فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ) .. جا ئیتر ئەوانەی سنووری گوناهەکانیان بەزاندوەو گوێیان نەداوەتە هیچ فەرمان و رێنماییەکی خوای پەروەردگارو خراپەکارو بەدڕەفتار بوون لە ژیانیاندا .

( وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ) .. وە ئەو جوٚرە کەسانە خوٚشیی ژیانی دنیای سەرزەوی مەستیان ئەکاو وایان لێئەکات گویٚ نەدەنە پاداشت و خەڵاتەکاتی روٚژی دوایی .

( فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ) .. ئا ئەوانە ئاگرو سزای سەختی دوٚزەخ ئەبێتە جێگاو موٚڵگەیان و ئەویٚ ئەبیٚ بە بارەگای شەوو روٚژیان !!

( وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ) .. بەڵام ئەو کەسانەی شەرم لە خوای خوٚیان ئەکەن و لە تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە ئەترسن و هەواو ئارەزوەکانی خوٚیان لغاو ئەکەن و ریٚ لە ئارەزوە نزمەکانیان ئەگرن کە سەرهەڵبداو چالاك بێت نەبا لە خشتەیانبەریٚو ریٚ خوٚشکەربن بوٚ گوناهکاری و بەدڕەفتاری .

( فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ) .. بوٚ ئەو تەرزە لە خەڵکی ، خوای گەورە بەهەشتی پان وبەرین و رازاوەی بوٚ ئامادەکردوون و ئەیکاتە بارەگاو جێی حەوانەوەی شەووروٚژیان .

( يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ) .. خەڵكانێكی گەمژەو لاساری بێ باوەڕ بە توانج و تەلار لە پێغەمبەریان ئەپرسی : ئەرێ داهاتنی ڕۆژی قیامەت ئەبێ چ كاتێك بێت ؟

( فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ) .. لە كاتێكدا كە تۆ خۆت بەرپرسیار نیت لە كاتوساتی داهاتنی ئەو ڕۆژەو نەك هەرئەوە بەڵكو نە تۆو نە هیچ بوونەوەرێك لەم گەردوونەدا ناتوانێت ئەو ڕۆژە دیاری بكات .

( إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ) .. بەڵكو بە تەنها خوای تاكوتەنهای باڵادەست ئاگادارو زانایە بەو ڕۆژەو بە داهاتنی كاتوساتی و هەر ئەو خۆی بەدیهێناوەو كاتەكانی دیاری كردوە .

( إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ) .. بەلاَم تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە كە ئاگاداری خەڵكی بكەیتەوە بەتایبەتیش ئەو كەسانەی ترسی ئەو ڕۆژەیان لە دڵدایەو حساب بۆ سزاو ئەشكەنجەكانی ئەو ڕۆژە ئەكەن و ئاواتەخوازی ڕزگاربوون و سەرفرازی ئەو كاتوساتانەن .

( كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ) .. خۆ ئادەمیزاد كاتێ كە ڕووداوو دیمەنەكانی ئەو ڕۆژە سەخت و دژوارانە ئەبینێت هەرچی خۆشیەكانی ژیانی پێشووی هەیە لەبیردەكاو لەترسانا وائەزانێت سەرجەم تەمەنی سەرزەوی بریتی بوە لە چەند ساتێك لەشەو یا ڕۆژو ئەڵێی هەر هیچ نەژیاوەو هیچ خۆشیەكیشی نەچێشتوە !! .. جا گەر ژیانێك ئەوە دواڕۆژەكەی بێت ئەبێ ئەو كەسە چەند داماوو بێ مێشك و گەمژەو بەدبەخت بێت كە پێی هەڵبخەڵتێ و خۆشیە كەم وەخت و سادەكانی

مەستی بکات و خۆشی و بەهرە فراوان و نەبڕاوەکانی ڕۆژی دوایی لەبیربکاو هەوڵیان بۆ نەدات .....!

* * *

سورەتی ( عبس )

مەککیە .... چل و دوو ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ ) .. بێزاری و رووگرژی دەربڕی و لای کرد بەولاوە .

( أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ) .. کاتێ کە ئەو پیاوە نابینایە هاتە لای .. ( خوای گەورە لەم ئایەتەدا گلەیی لە پێغەمبەر دەکات بەوەی کە لای نەکردەوە بەلای ئەو پیاوە نابینایەدا کە بە ویست و ئارەزووی خۆی بانگەوازی ئیسلامی هەڵبژاردبوو ، وە بەپێی خۆشی هاتبوە خزمەت پێغەمبەر ( ﷺ ) . بەلاّم پێغەمبەر لەو کاتەدا خەریك بوو لەگەڵ پیاو ماقولاّن و سەرانی قورەیشدا کۆدەبووەوە بەهیوای ئەوەی باوەڕ بە ئاینەکەی بێنن و دوای بەرنامە نوێیەکەی ئیسلام بکەون ) .

( وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰ ) .. خۆ تۆ چوزانیت بەڵکو ئەو پیاوە هەژارو نابیناو لانەوازە بەو دڵە پاکەی خۆیەوە باوەڕت پێ بێنێ و بیەوێ دڵودەرونی خۆی پاك و بێگەرد راگرێ ؟

( أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ) .. یاخود بیر لە گەورەیی و دەسەلاّتی خوای پەروەردگاری بکاتەوەو سوودمەندو بەهرە وەرگر بێت لەم ئایین و بەرنامە نوێیە ؟

( أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ) .. بەلاّم ئەوەی گوێت ناداتێ و ئەو ئایین و بەرنامە نوێیە

گرنگ نیه بەلایەوە .

﴿ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴾ .. وا تـــۆ خـــەمی ئـــەخۆیت و خـــۆت هەوڵئـــەدەیت بیگەیتیٚ و تیٚی گەیەنیت !

﴿ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴾ .. هـــیچ غـــەمت نـــەبیٚ ، خـــۆ ئـــەو باوەڕنـــەهیٚنان و لاساریەی ئەو هیچ زیانێکی بۆ تۆ نیەو تۆ لیٚی بەرپرسیار نابیت .

﴿ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴾ .. کەچـی ئـەو کەسـەی خـۆی هەوڵیـداوەو رائـەکات بە شوێنتا .

﴿ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴾ .. وە لەخوا ئەترسیٚ و خۆی ئەپارێزێت لە گوناه .

﴿ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴾ .. تۆ گوێی نادەیتیٚ و حسابی بۆ ناکەیت !

﴿ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴾ .. نـەخێر وانـابیٚ ، ئـەم کـارە خـۆی هـەر بریتیـە لـە بیرخستنەوەو ئاگادارکردنەوە .

﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾ .. جا هەرکەسـیٚ خۆی ئارەزووی لیٚبیٚ و مەبەسـتی بێت ، با بەئاگابێتـەوەو سوود لەم بیرهێنـانەوەیە وەرگرێت و گوێڕایـەڵی فەرمایشـت و ئایەتە پیرۆزەکانی خوای بالآدەست بێت .

﴿ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴾ .. ئەو ئایەتانـەی کە لـە چەند پـەڕاوێکی پـاکو پـیرۆزدا هەڵگیراون .

﴿ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴾ .. لە جیٚگایەکی بڵندو خاوێن و شیاویشدا پارێزراون .

( بِأَيْدِي سَفَرَةٍ ) .. وه له‌سه‌ر ده‌ست و له‌ڕێگای كۆمه‌ڵێك فریشته‌ی به‌ڕێزو تایبه‌ته‌وه هه‌ڵده‌گیرێ و ده‌گه‌یه‌نرێته ده‌ست مرۆڤی سه‌رزه‌وی .

( كِرَامٍ بَرَرَةٍ ) .. ئه‌و فریشتانه زۆر ڕێزدارو خاوه‌ن پله‌و پایه‌و ده‌ستپاكن له‌راپه‌ڕاندنی ئه‌ركه‌كانیاندا .

( قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ) .. ئای ئاده‌میزاد ! ده‌ك له‌ناو بچیت و خوا له‌ناوتبه‌رێ !! چه‌ند بێ باوه‌ڕو گومڕاو به‌دكاری !!

( مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُۥ ) .. ده‌با بزانێ كه خوای په‌روه‌ردگاری چۆن و له‌چی دروستی كردوه .

( مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ) .. له تۆوێكی ئێجگار بچوك و نادیاره‌وه به‌دیهێناوه و به‌م شێوه ناوازه‌و بێ وێنه‌و ڕێك وپێكه له نه‌بوونه‌وه هێناویه‌ته بوون !

( ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ) .. پاشان ڕێی ژیان و به‌رده‌وام بوونی ژیانی پیشان داوه‌و فێری كردوه چۆن له‌سه‌ر زه‌ویدا به سه‌ربه‌رزی بژی .

( ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ) .. ئینجا دوای ته‌واوبوونی ڕۆڵی له‌م سه‌رزه‌ویه‌دا گیانی لێسه‌ندۆته‌وه‌و به خاكی سپاردوه .

( ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ) .. دواتر و له‌و كاتوساته‌ی كه خوای بالاده‌ست خۆی ئاره‌زوو ده‌كات زیندووی ئه‌كاته‌وه‌و ئه‌یگوێزێته‌وه بۆ قۆناغێكی تری ژیانی .

( كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ ) .. نه‌خێر ! ئه‌م ئاده‌میزاده ئه‌و ئه‌ركانه‌ی پێی

ڕاسپێردرابوو نەیگەیاندوەتە جێی خۆیان و بێ وەفاو سپڵە بوە بەرامبەر نازو نیعمەت و بەخششەکانی خوای پەروەردگاری !

﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَـٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴾ .. دەبا سەیرێکی ئەو خواردنانە بکات کە ڕۆژانە دێنە بەردەمی و ورگی خۆیانی لێ پڕدەکات و بەبێ ئەوان ژیانی مەحاڵ و نەگونجاوە .

﴿ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴾ .. با بشزانێت کە هەر ئێمەین بارانمان بەخوڕ لەو ئاسمانانەوە بۆ ناردونەتە خوارێ .

﴿ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴾ .. پاشان ئەو زەویە ڕەق و سەختەمان پێ پاراوکردوە تا ئەو ئاوە هەڵمژێ و بیتەقێنێ و نەرمی بکاتەوە .

﴿ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴾ .. تا وای لێهات لەو هەناوە ڕەقەوە ئەو هەموو تۆو دانەوێڵەیەمان لێ ڕواندوەو شینمان کردوە .

﴿ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴾ .. بەرهەمەکانی ڕەزو ترێو سەرجەم سەوزەواتەکانیش کە بەردەوام لێدەکرێنەوە و دەخورێن .

﴿ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴾ .. هەروەها بەروبوومە بەفەڕو زۆرەکانی دار زەیتون و دارخورماش .

﴿ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴾ .. باخ و بێستانە چڕوپڕەکانی سەرزەویش هەمووی بەخششی ئێمەن بۆ ئادەمیزاد .

﴿ وَفَـٰكِهَةً وَأَبًّا ﴾ .. سەرجەم میوەهات و گژوگیاو گوڵ و گەڵاو سەوزایی هەر

لەو زەویەوە بەرهەم هاتوون .

( لَّكُمۡ مَّتَـٰعًا وَلِأَنۡعَـٰمِكُمۡ ) .. ئەمانەمان هەموو کردوّتە مایەی بەردەوام بوونی گوزەران و ئاسوودەیی ژیانی خۆتان و مەڕومالاّت و ولاّخ وپەلەوەرەکانتان .

( فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ) .. جا ئیتر گەر کاتێك ( الصاخە ) بەرپابوو وە بەچاوی خۆتان بینیتان .. هەر بەناوەکەیدا دیارە بریتیە لە دەنگ و هاوارێکی وا کە کەس خۆی بۆ راناگیرێت لە بەریدا !

( يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ ) .. لەبەر ترس وسامناکی ئەو رۆژو ساتانەدا کەس ئاگای لە کەس نامێنێ ، تەنانەت خەڵکی ناپەرژێتە سەر برای شیریی خۆیی و هەر خەمی رزگارکردنی خۆیەتی !!

( وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ) .. نەك هەر برا بەڵکو ناپەرژێتە سەر دایك و باوکی خۆشی و خۆیان تێناگەیەنێت .

( وَصَـٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ) .. جگە لەوانیش ئاگای لە ئەندامانی خێزانەکەشی نامێنێت ، ئەو ژنەی بە بست لەیەکتر جیا نەئەبونەوەو یەکتریان زۆر خۆشئەویست ئێستا هەر ناپەرژێتە سەری ! ئاوڕ لە منالە ئازیزەکانیشی ناداتەوە کە جگەرگۆشەو نازداری دایك و باوکیان بوون لەدنیادا .

( لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ يُغۡنِيهِ ) .. چونکە لەو رۆژە سەخت و دژوارەداو لە بەر سامناکی و هەلومەرجی یەکلاکەرەوەی ئەو ساتانە . کەس ناپەرژێتە سەرکەس و هەرکەس هەر خۆی لەبیرەو خەمی قوتاربوون و سەلامەتی خۆیەتی و ئاگای لە کەسی تر نامێنێت !!!

( وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ) .. كه‌چی هه‌ر له‌و بارودۆخه سه‌خت و ناله‌بارو سامناكه‌شدا كه‌سانێك ده‌بینرێن زۆر رووگه‌ش و ئاسوده‌و خۆشحاڵن !!

( ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ) .. ده‌م به پێكه‌نین و رووخۆش وشادمانن .

( وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ) .. كه‌سانێكی تریش به پێچه‌وانه‌وه , رووگرژو ره‌نگ زه‌رده‌هه‌ڵگه‌ڕاوو هه‌ڵبزڕكاون .

( تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ) .. له ترسانا ماندوو شه‌كه‌تن و چۆكیان شكاوه‌و شه‌رمه‌زارو سه‌رشۆڕن .

( أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ ) .. ئه‌مانه ئه‌و كه‌سانه‌ن كه باوه‌ڕیان به خواو به‌رنامه پیرۆزه‌كانی خوای په‌روه‌ردگار نه‌ده‌هێناو پشتیان كردبوه هه‌موو راستیه‌كان و ژیانیان له به‌دكاری‌و به‌دڕه‌وشتیدا بردبوه سه‌ر !!

* * *

سورەتی ( التکویر )

مەککیە ... بیست ونۆ ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ئەم سورەتەش لە سەرەتادا نمایشی روداوو دیمەنە سامناکەکانی رۆژی قیامەت دەکاو ئەفەرموێت :

( إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ) .. کاتێ کە ئەو رۆژە گەرم و درەوشاوەیە ساردئەبێتەوەو گرو کڵپەی نامێنێ .

( وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ) .. کاتێ کە ئەستێرەکان لە یاساو خولگەی خۆیان دەرئەچن و تاریك دادێن و روناکیان تیانامێنێت .

( وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ) .. کاتێ کە چیاو کێوەکان لەبن دەرئەهێنرێن و بە ئاسمانەکاندا پەرتو بڵاو ئەکرێنەوە .

( وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ ) .. کاتێ کە( عیشار ) پەکی ئەکەوێ و لەناودەچێ.. عیشار وشترێکی ئاوسە کە لای عەرەبی بیابانشین زۆر خۆشەویستەو بەهاو نرخی بەرزە لایان .

( وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ) .. کاتێ کە سەرجەم گیانەوەرو درندەکان زیندوو دەکرێنەوە و راپێچدەکرێن بەرەو گۆڕەپانی دادگایی و لێپرسینەوە .

( وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ) .. کاتێ کە دەریاکان هەڵدەچن و ئە تەقێنرێنەوە .

﴿ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ ﴾ .. كاتێ كه گیانەكان دەكرێنەوە بە لاشەكانداو زیندووئەكرێنەوە .

﴿ وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ﴾ .. كاتێ كە كیژۆڵە زیندەبەچاڵكراوەكان زیندووئەكرێنەوەو لێیان دەپرسرێت :

﴿ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ﴾ .. ئایا بە چ تاوانێك ئاوا زیندەبەچاڵكران ؟

﴿ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ ﴾ .. كاتێ كە نامەی كردەوەكانی مرۆڤ ئاشكرا دەكرێ و ناوەرۆكی رادەگەیەنرێت .

﴿ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ﴾ .. كاتێ كە ئاسمانەكان هەڵدەگیرێن و لادەبرێن و والادەكرێن .

﴿ وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ ﴾ .. كاتێ كە ئاگرەكانی دۆزەخ خۆشدەكرێن و ئامادە ئەكرێن بۆ سزادان .

﴿ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴾ .. كاتێ كە بەهەشتەكان نزیك دەكرێنەوە بۆ پێشوازیكردن لە میوانەكانیان .

﴿ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ ﴾ .. ئا لەو كاتانەدا دەرونی هەموو مرۆڤێك تێدەگاو لای روونده‌بێتەوە چ كارو كردەوەیەكی ئەنجامداوە لە ژیانیدا و چ چارەنوسێك چاوەڕێی دەكات .

﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ﴾ .. ئیتر با سوێند نەخۆم بە ( الخنس ) .

( ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ) ..كه‌ بریتین له‌و ئه‌ستێره‌ پرشنگدارانه‌ی وورده‌ وورده‌ له‌ خولگه‌كانی خۆیاندا بزرده‌بن و دیارنامێنن .

( وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ) .. وه‌ سوێند نه‌خۆم به‌ شه‌وگاری تاریك كاتێ تاریكیه‌كه‌ی باڵ به‌سه‌ر هه‌موو شتێدا ده‌گرێت .

( وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ).. یا به‌ به‌ره‌به‌یانی زیندوو كه‌ گیان ده‌كات به‌ به‌ر زینده‌وه‌رانداو ئه‌یانخاته‌وه‌ بزاوتن .

( إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ) .. سوێند ده‌خۆم كه‌ ئه‌م راستیانه‌ی باسكران وته‌ی په‌یامبه‌رێكی رێزدارو خۆشه‌ ویسته‌ ( مه‌به‌ست له‌ جوبرائیله‌ )ه‌ ــ سه‌لامی خوای لێبێت ــ

( ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ) .. هێزو توانایه‌كی بێ وێنه‌ی پێبه‌خشراوه‌ له‌ لایه‌ن خاوه‌ن عه‌رشی بالاْده‌ست و به‌ تواناوه‌ .

( مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ) .. له‌ ناو ده‌سته‌ی بالاْی فریشته‌كانیشدا سه‌روه‌ریی هه‌یه‌و فه‌رمانه‌كانی ئه‌نجامده‌درێن و خۆشی ده‌ستپاك و كاربه‌جێ و كارامه‌یه‌ .

( وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ ) .. ئه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ی ئێستاشتان شێت نیه‌و وته‌كانی سه‌رجه‌م راستن و له‌ لایه‌ن خوای په‌رروه‌ردگاره‌وه‌ بۆی هاتۆته‌ خوارێ .

( وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ ) .. كه‌ جبرلیلیشی به‌ چاوه‌كانی خۆی له‌ ئاسۆی

گەش و روونەوە بینیوەو پەیامەکەی لێوەرگرتوە .

﴿ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴾ .. ئەو زانیاریانەش کە لەغەیبی نادیارەوە بۆی دێت و دەیانگەیەنێت راست و دروستن و لە خۆیەوە رێکیان ناخات .

﴿ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴾ .. بێگومان ئەو زانیاریانەش وتەی شەیتان نیەو شەیتان تواناو دەسەلاتی شتی وای نیە .

﴿ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴾ .. جا ئیتر بەرەو کوێ ئەچن و روو لەکوێ ئەکەن و چ بۆچوونێك بە مێشکتاندا دێت ؟

﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ .. کە ئەمانە هەمووی بیرهێنانەوەی راستیەکانە بۆ سەرجەم بوونەوەرانی سەرزەوی .

﴿ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴾ .. بیرهێنانەوەیە بۆ هەرکەسێك مەبەستی فێربوون و ناسین و بەدەستهێنانی راستیەکان بێت لە ژیانیدا .. گرتنەبەرو هەڵبژاردنی یاساو بەرنامەی خوای پەروەردگاریش مەبەست و ئاواتی بێت لە ژیانداو نەیانگۆڕێتەوە بە ئارەزووپەرستی یا بیرو بۆچوونە ساکارو پووچەڵەکانی دروستکراوی مرۆڤی کورتبین و کەمدەسەلات .

﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ .. خۆ ئێوە هەڵبژاردنی رێگای راست و هیواو ئاوات و ئارەزووەکانتان لە دەست خۆتاندا نیە ، گەرخوای بالادەست ئاسانکارایتان بۆ نەکات و رێنماییتان نەکات بەرەو رێگای راست گرتنەبەرو چاکە خوازی ویستن و دواتریش سەرفرازیتان ...

* * *

سوره‌تی ( الإنفطار )

مه‌ككيه .... نۆزده ئايه‌ته

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ) .. كاتێ كه ئاسمانه‌كان له‌يه‌ك ئه‌ترازێن و كه‌رت و په‌رت ده‌بن .. كه ئه‌بێ چ ديمه‌نێكی مه‌ترسيدارو تۆقێنه‌ربێت .؟

( وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ) .. كاتێ كه هه‌ساره‌كان وه‌كو تۆو پرژێندران به ئاسمانه‌كاندا .

( وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ) .. كاتێ كه ده‌رياكان ئه‌ته‌قێنرێنه‌وه و سه‌رجه‌م سه‌رزه‌وی‌و وشكانی داده‌پۆشێت .

( وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ ) .. كاتێ كه گۆڕه‌كان هه‌ڵئه‌درێنه‌وه‌و لاشه‌ی مردوانی ناو ئه‌وگۆڕانه زيندوو ئه‌كرێنه‌وه .

( عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ وَأَخَّرَتۡ ) .. له‌وكاتانه‌دا هه‌ر گيان و ده‌روونێك لای روون و ئاشكرا ئه‌بێت چ كارو كرده‌وه‌يه‌كی له‌گه‌ڵ خۆی هێناوه‌و چيشی ئه‌نجامداوه له‌ژيانيدا .

( يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ) .. ده‌سا ئه‌ی مرۆڤ چی وای ليكردويت وا لوتبه‌رزو لاسار بيت به‌رامبه‌ر ئه‌و هه‌موو به‌خشش و نازونيعمه‌ت و به‌هره زۆرانه‌ی خوای په‌روه‌ردگارت .

( ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ) .. ئـــەو خـــوا مەزنـــەی لەنەبوونـــەوە بەدیهێناویو لە جوانترین و ڕێکترین شێوەدا دروستی کردویت .

( فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ) .. خـۆت ببینـەو بزانـە دیمـەن و بـەژن و باڵات چەند بێ وێنەیە لەناو بوونەوەرانداو خوای پەروەردگارت بە ویستی پیرۆزی خۆی چۆن پێکیهێناویت ؟

( كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ) .. نـەخێر ، لەســەر ئـەم هـەموو بەخـشش و میهرەبانیەشــەوە لاســاری ئەکــەن و داهــاتنی ڕۆژی لێپرســینەوە بــەدرۆ ئەخەنەوەو باوەڕتان پێی نیە !

( وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَـٰفِظِينَ ) .. بێگومـان هەریـەك لـە ئێـوە چـەند فریـشتەیەکی تایبەتی بۆ دانراوە تا کاروکردەوەکانتان هەژمارو تۆمار بکەن و ئاگایـان لـە هەموو هەڵسوکەوتەکانتانە .

( كِرَامًا كَـٰتِبِينَ ) .. هـەر ئـەو فریـشتە بـەڕێزو پاکیزانـەن کـە بەرپرســیاری تۆماری کاروکردەوەکانتانن .

( يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ) .. بۆیـە بـاش ئاگـادارن و ئـەزانن چـی ئەکـەن و چـی ناکەن .

( إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ) .. ســەرەنجامیش خواپەرســتان و بــاوەڕداران لــە جێگـەو ڕێگەیـەکی پـڕ خۆشـی و نـازو بەهرەدان و لـەو پـەڕی ئاسـوودەییدا ژیان دەبەنە سەر .

﴿ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴾ .. بەدکاران و بێ باوەڕان و گومڕایانیش لە ناو دۆڵە ئاگرەکانی جەهەننەمدا ئەتلێنەوەو سزائەدرێن .

﴿ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴾ .. کە ڕۆژی لێپرسینەوەو تۆڵەسەندن ژوانیانەو بە پەرۆشەوە چاوەڕوانیانە !

﴿ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَآئِبِينَ ﴾ .. کەسیشیان ناتوانن لەو چارەنووسە ڕەش و ناهەموارەیان هەڵبێن و هەرگیز قوتاربوونیان نیە .

﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴾ .. ئاخۆ تۆئەزانیت ئەو ڕۆژە سەختە چ ڕۆژێکە!!

﴿ ثُمَّ مَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴾ .. دیسانەوە ئەڵێم : ئاخۆ تۆئەزانیت ئەو ڕۆژە سەختە چ ڕۆژێکە !!

﴿ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْـًٔا ۖ وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴾ .. ئەو ڕۆژەی کە هیچ کەس دەسەڵاتی نیەو کەس ناتوانێت فریای کەسی تر بکەوێو بە هانایەوە بێت !. هەموو تواناو کارو فرمانەکانیش هەر لە ژێر دەسەڵات و توانای خوای باڵادەست و پەروەردگاری هەردوو جیهانەکاندا دەبێت .. هەموو هەر چاوئەبڕینە سۆزو بەزەیی و بەخششی ئەو پەروەردگارە میهرەبانە ...

* * *

## سورەتی ( المطففين )

**مەککیە .... سی و شەش ئایەتە**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

خوای گەورە لەسەرەتای ئەم سورەتەدا لە ناپاکان تووڕەیەو ئەفەرموێ :

( وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ) .. چارەنووسی ناپاکان لەناوچوون و چێژتنی سزای سەختی ناو دۆڵە ئاگرەکانی جەهەننەمە .

( ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ) .. ئەو ناپاك و ساختەکارانەی کە مافی خۆیان بەتەواوی لە خەڵکی وەرئەگرن و خاتری کەس ناگرن .

( وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ) .. کەچی مافی خەڵکی دەخۆن و بەتەواوی نایگەیەننەجێ و دەستیان سووك دەکەن چ لە کێشانەدا بێت یا لە پێوانەی شتەکاندا بێت .

( أَلَا يَظُنُّ أُو۟لَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ) .. ئەی باشە ئەوانە نازانن کە هەموویان دوای مردنیان لە ڕۆژێکی ئێجگار گرنگ و سامناکدا زیندووئەکرێنەوەو لێپرسینەوەیان لە گەڵدا ئەکرێت ؟ .

( يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ) .. لە ڕۆژو کاتێکدا کە سەرجەم ئادەمیزادی سەرزەوی زیندوو ئەکرێنەوەو لەبەردەم خوای بالأدەستی هەموو جیهان و هەموو بوونەوەراندا ڕادەگیرێن بۆ لێپرسینەوەو دادگاییکردن ؟

( كَلَّا إِنَّ كِتَـٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ) .. نەخێر وانابێ ! بێگومان بن لەوەی کە تۆماری سەرجەم کارو کردەوەکانی بەدکاران و خراپەکاران هەڵگیراوەو لە ( سجين )دا پارێزراوە .. تا کات وساتی خۆی دادێ و دەخرێتە روو !

( وَمَا أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ) .. خۆ تۆش نازانیت سجین چیەو لە کوێیە ! .. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە شتێکی زۆر گرنگ و نادیارە !

( كِتَـٰبٌ مَّرْقُومٌ ) .. کتێب و تۆمارێکی سەرمۆرکاوی وایە کە نە هیچی لێ زیاد دەکرێ و نە لێشی کەمدەکرێتەوە !

( وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ) .. هەروەها سزای سەختی دۆڵەکانی جەهەنەمیش چاوەڕێی ئەو بێ باوەڕانە ئەکات کە راستیەکان بەدرۆ ئەخەنەوە .

( ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ) .. ئەوانەی داهاتنی رۆژی دوایی و رۆژی دادوەری و لێپرسینەوە بەدرۆئەخەنەوەو باوەڕیان پێی نیە .

( وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ) .. کە داهاتنی ئەو رۆژە راستیەکە ئەوەی باوەڕی پێی نەبێت کەسانێکن زۆر تاوانبارو ملهوڕو بەدکارو گوناهبارن لە ژیانیاندا .

( إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَـٰتُنَا قَالَ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ) .. ئەو نەفامانە ئەوەندە بێ ئەدەبی ئەنوێنن بەرامبەر ئایەت و بەڵگەکانی خوای پەروەردگار ، کاتێ ئایەتەکانیان بۆ ئەخوێندرێتەوە ئەڵێن : ئەوانە هەمووی چیرۆك و حیکایەتی دێرزەمانەو بەکەڵکی ئێستا نایەن .

( كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ) .. نەخێر ! (ئەوانە سەریان دای لەبەرد).. بەڵكو لە ئەنجامی كەڵكەبوونی گوناهو بەدڕەفتاری خۆیان ، دڵودەرونیان پەردەیەكی رەشی بەسەردا هاتووەو راستیەكان نابینیٚ و سەریان لە خۆیان شێواندوە .

( كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ) .. نەخێر ! ئەوان ناماقووڵیان كرد ، ئەو بەدبەختانە لەو رۆژە ناهەموارەدا دوور ئەخرێنەوە لە سەرچاوەی سۆزو میهرەبانی و بەخشندەیی و لێبوردن و بەخشش كە ئەویش خوای پەروەردگاری بەخشندەی میهرەبانە .. ئیتر بیٚ بەش ئەبن لە بینینی زاتی پیرۆزو بیٚ وێنەی خوای بالآدەست ! كە ئەوە گەورەترین و سەختترین سزای ئەو رۆژە سامناك و دژوارەیە .

( ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ ) .. نەك هەرئەوە بەڵكو ئەوانە تووشی سزای سەخت و سوتێنەری ئاگری جەهەننەمیش دەبنەوە .

( ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ) .. هەر لەو ساتانەشدا پێیان دەوترێت : دەبچێژن . ئەمە ئا ئەوەیە كە ئێوە نەك هەر باوەڕتان پێی نەبوو بەڵكو بە درۆشتان دەخستەوە .

( كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ ) .. دیسانەوە نەخێر ! تۆماری كردەوەی بڕواداران و چاكە خوازان لە پلەو پایەیەكی بەرزو بڵندو بەنرخدایە كە ( علیین )ە .. كەواتە گەر( علیین ) ئاوا بیٚ دەبیٚ بە پێچەوانەی ئەو ( سجین )ی بیٚ باوەڕان جێیەكی نزم و كەم بەها بێت !

( وَمَا أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ) .. تەنانەت تۆش نازانیت ( علیون ) چییەو چۆنە !

( كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ) ..کە کتێب و تۆمارێکی سەرمۆرو پارێزراوە .

( يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ) .. بەلام فریشتە پایەبەرزو خاوەن پلەو پایە تایبەتەکان ــ وە لەبەر پیرۆزی ئەو جێیانە ــ دەتوانن ئەو تۆمارانە ببینن و ئەزانن لە کوێ هەڵگیراوە .

( إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ) .. ( لە بەرامبەر ئەو چارەنووسە سەخت و ناهەموارەی بێ باوەڕاندا ) .. بڕواداران و چاکەخوازان لە نازو نیعمەت و خۆشییەکی بەرفراوان و نەبڕاوەی بەهەشتەکانی خوای پەروەردگاری خۆیاندا ژیان دەبەنەسەر .

( عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ) .. یەکێ لەو خۆشیانەشیان ، دانیشتنیانە لەسەر سیسەمی زۆر نەرموشل و لە جێگایەکی وا بڵندو سەرنج راکێشدا بۆیان دانراوە کە بتوانن بەهەر چواردەوری خۆیاندا بڕوانن و هەتا چاو بڕکات نازو نیعمەت و دیمەنی جوانی بەهەشتەکان ببینن ..

( تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ) .. لە روخساریاندا سیمای نازو نیعمەت و تێرو تەسەلی و خۆشگوزەرانیان پێوەدیارە .

( يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ) .. شیلەی گولاوێکی وایان ئەدرێتێ کە کەس دەمی بۆنەبردوەو هەر لە و جام وکاسانەی خۆیدا کە تێکراوە هەڵگیراوە بۆیان .

( خِتَـٰمُهُۥ مِسۡكٌۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ ) .. بە بۆن و بەرامی نایابی میسك سەرپۆش كراوەو دەسا ئیتر خەڵكیی با بۆ بەدەسهێنانی ئەم پلەوپایەو نازو نیعمەتە پێشبڕكێ بكەن و هەوڵی بۆبدەن .. نەك خوا لەخۆیان تووڕەبكەن و خۆیان شیاوی سزاو سەختی ئاگری جەهەنەم بكەن.

( وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسۡنِيمٍ ) .. ئەو خواردنەوەیە كە هەڵپچڕا بۆیان هەندێ لە ئاوی كانیاوێكی خۆش و بەتام و بێ وێنەی تێكەڵاو ئەكرێت كە پێی ئەوترێ ( تەسنیم ) .. تا تاموچێژێكی زیاترو خۆشتر بچێژن لەو دانیشتنەیاندا .

( عَيۡنًا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ ) .. ئەو كانیاوە بەتەنیا بۆ ئەوانە تەرخانكراوە كە لە پلەوپایەدا زۆر نزیكن لەخوای بالآدەستەوەو خۆشەویست و لەپێشن لای پەروەردگاریان .

( إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ) .. ئەو بێ باوەڕانەی دڵڕەق و بێ ویژدان و ملهوڕبوون لە دنیادا ، بە چاوێكی سووكەوە سەیری موسوڵمانانیان ئەكردو گاڵتەیان پێ ئەكردن و پێیان پێئەكەنین .

( وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ) .. وە گەر بە لایاندا تێپەڕینایە تیرو توانجیان تێئەگرتن و سووكایەتیان پێئەكردن .

( وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ) .. ئینجا زۆر بە خۆشحاڵی و دەم بە پێكەنینەوە ئەگەڕانەوە ناو كەسوكاریان و وایان ئەزانی ئیشێكی زۆر

باشیان کردوە .

( وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ) .. لەوەش سەیرتر ئەوەبوو کە موسوڵمانەکانیان ئەبینی لە دوورەوە ئاماژەیان بۆ ئەکردن و ئەیانوت : ئا ئەوانە هەموو سەرلێشێواوو نەفامن و لەڕێ لایانداوە !

( وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ ) .. باشە خۆ ئەمان نەنێرراون بۆ ئەوەی ئاگایان لەوان بێ و چاودێری هەڵسوکەوتیان بکەن و کارو کردەوەیان هەڵبسەنگێنن !

( فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ) .. بەڵام وا ئەمڕۆ ـ کەڕۆژی دواییە ـ ئەو موسوڵمانە بڕوادارانە پڕ بەدڵی خۆیان بەو بێ باوەڕە سەرلێشێواوو ملهوڕانە پێئەکەنن و گاڵتەیان پێئەکەن .. کە بەو لووتبەرزیو نەفامیەیان ، خۆیان بە چ دەردێك بردو خۆیان توشی چ چارەنووسێك کرد !

( عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ) .. وا بۆخۆیان لە سەر سیسەمی نەرم وشل و لە سەر سەکۆو جێی خۆش و بڵندەوە سەیری هەموو لایەکی خۆیان ئەکەن .. چاویان بە شوێنی سزادان و ئەشکەنجە خواردنی بێ باوەڕانیش دەکەوێت.

( هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ) .. جا ئایا ئەبێ ئەو بێ باوەڕو سەرلێشێواوو گومڕاو بەدکارانە بەسزای خۆیان نەگەیشتبن ...؟

* * *

سورەتی ( الإنشقاق )

مەككیە ... بیست و پێنج ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ) .. كاتێ كە ئاسمان لە یەك ئەترازێ و پارچەپارچە ئەكرێت .. كە خوای بالأدەست هەرخۆی ئەزانێت چۆنەو چ كارەساتێكی سەرسوڕهێنەرە .

( وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ) .. وە ملكەچی فەرمانی خوای خۆی دەبێ و ئەزانێت كە هەر ئەو خاوەنێتی و چی ئارەزووبكات وای بە سەر دێنێت .

( وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ) .. كاتێ كە زەوی درێژدەكرێتەوەو شێوە هێلكەییەكەی ئێستای نامێنێت .

( وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ) .. وە ئەوەی لە ناخیدایە لە لاشەی مردوان و سەرجەم پێكهاتوەكانی تریشی فڕێ ئەداتە دەرێ و چیتر توانای شاردنەوەیانی نامێنێ !

( وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ) .. هەروەها ئەویش ملكەچی فەرمانی خوای خۆی دەبێ و ئەزانێت كە هەر ئەو خاوەنێتی و چی لێدەكات لێی دەكات .

( يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ) .. ئەی ئادەمیزاد بێگومان تۆ لە هەوڵدان و كۆششێكی بەردەوام دایت و سەرەنجام هەر دێیتەوە بەر بارەگای خوای پەروەردگاری خۆت وچیت چاندبێت هەر ئەو

ئەدرویتەوەو پاداشت یا سزای خۆشت هەر وەردەگریەوە .

( فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ) .. جـا هەرکەسـێ لـەو رۆژەدا تۆمـاری کردەوەکانی بدرێتە دەستی راستی .

( فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ) .. ئـەوا خۆشـبەختەو لێپرسـینەوەیەکی سووك و ئاسانی لەگەڵدا دەکرێ و چارەنووسی روونـە و ئاسۆی گەشـە.. خـاتوو عائیـشە ئەڵێ : چـەند جارێك لـە پێغەمبـەرم گـوێ لێبـوە (ﷺ) لـە نوێژدا ئەیفەرموو : (( اللهم حاسبني حسابا يسيرا )) .

( وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ) .. دواتـریش بـە خۆشـحاڵی و رووگەشـی و پێکەنینەوە ئەگەڕێتەوە ناو دۆست و خزم و کەس وکاریەوە .

( وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ) .. بـەلاَم ئـەوەی تۆمـاری کردەوەکـانی لـە پشتەوە ئەدرێتەوە دەستی .

( فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ) .. ئەوا هـاواری لـێ هەڵئەسـێ و ناڵـەناڵێتی و قـوڕی بەسەر .

( وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ) .. دواتـریش ئـاگری سـەخت و سـوتێنەری جەهەنـەم چاوەڕێیەتی و دەبێتە جێی شەووڕۆژی .

(إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ) .. ئـەو لـەژیانی دنیایـداو لـە نـاو کـەس وکـارو برادەرانیدا شادو دڵخۆش و مەست وحەیران بوو !

( إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ).. ئـەو گێلـە وای ئـەزانی هـەرگیز ناگەڕێتـەوە بـەردەم

خوای پەروەردگارو لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت !

( بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا ) .. بەڵێ ! بێگومان خوای پەروەردگاری ئاگای لە هەموو هەڵسوکەوت و رەفتارەکانی بوو .

( فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ ) .. دەبا سوێند نەخۆم به کاتی پاش خۆرئاوابوون .. ئەو کاتە ناسك و کورتە کە بێدەنگیەکی خامۆش باڵئەکێشێت بەسەر زەویدا.

( وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ) .. وە با سوێند نەخۆم به شەوو شەوگار کە تاریکیەکی سامناك و نادیار سەرزەوی دادەپۆشێت .

( وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ) .. وە با سوێند نەخۆم بە مانگی چواردەشەو کە پرشنگی روناکیەکەی هێمنی و ئارامیەکی سەرنج راکێش ئەبەخشێت بە سەرجەم بوونەوەرانی سەرزەوی .

( لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ) .. سوێند بەو شتانە هەمووی ئێوە هەرهەمووتان ئەبێ بە چەندین قۆناغدا تێپەڕن و چەندەها کۆسپ و تەگەرەو هەورازو نشێوی ژیان بێتە رێتان .

( فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ) .. کەواتە ( پاش ئەم هەموو سەرنج راکێشان و ئاگادارکردنەوەیە ) ئەو خەڵکە بۆ ملکەچ نابن و باوەڕێکی توندو تۆڵ و بێگرێ ناهێنن بە خوای بالادەستی هەموو جیهانەکان ؟ .. کە بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئەو هەموو بوونەوەرانەیە کە سوێندمان پێخواردن ..

( وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ) .. یا کاتێ ئەو ئایەتە بەرزو

پڕمانایانەی قورئانیان بۆ ئەخوێندرێتەوە ، بۆ دڵیان نەرم نابێ و هەر زوو باوەڕی پێناهێنن و کڕنوشی ڕێزو خۆشەویستی بۆخوای پەروەردگار نابەن؟

( بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ ) .. بەڵام مەخابن ! ئەو بێ باوەڕو کەللە ڕەق و گومڕاو سەرلێشێواوانە ئایەتەکانمان بەدرۆئەخەنەوەو باوەڕیان پێناهێنن .

( وَٱللهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ) .. خۆ خوای پەروەردگارو بە توانا زۆرباش ئاگای لە ناو دڵودەرونیانەو ئەزانێت نیازی چیانەو چیاندەوێت لە ژیانیاندا.

( فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ) .. دەسا مژدەی سزاو ئەشکەنجەیەکی ئێجگار سەخت و دژواریان بدەرێ کە بە هیچ شێوەیەك دەربازبوونیان نیە لەدەستی!

( إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ) .. بەڵام ئەو مژدە سزائامێزە ، ئەو باوەڕدارانە ناگرێتەوە کە کردارو رەفتاریان جوانەو بە پێی یاساو بەرنامە جوانەکەی خوای خۆیان رەفتاردەکەن لە ژیانیاندا .

ئەو موسوڵمانانە بێگومان پاداشتی بەنرخ و بەخششێکی بەردەوام و نەبڕاوەیان بۆدانراوە لەلایەن خوای پەروەردگاریانەوە

*   *   *

سورەتی ( البروج )

مەککیە .... بیست و دووئایەتە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ) .. ئـەم سـورەتە بـەم سـوێندە دەسـتپێدەکات : سوێند بەو ئاسمانەی کە ئەستێرەکان و هەسارەکانی لە خولگەکانیاندا بێ لادان لـە ڕێـڕەوی خۆیـان بەئاسـت و پلـەی جیـاواز بـە سـەربەخۆیی دەسوڕێنەوە .

( وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ) .. وە سـوێند بـەو ڕۆژەی کـە بۆمـان دیـاریکردوون و لێپرسینەوەتان تیایدا ئەنجامدەدرێت و هەموو بوونەوەران چاویان بڕیوەتە ئەو ڕۆژە .

( وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ) .. وە سوێند بەو ڕۆژەی کە هەموو بوونەوەران نمایش دەکـرێن و کاروکردەوکانیـان دیاروئاشـکرا ئـەبێت و بەچـاوی خۆیـان ئەیبیـنن و گەواهی لەسەر یەکتری ئەدەن .

( قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ) .. سـوێند بـەو شـتانە هـەمووی کـە خـاوەن چاڵە گەورەکە لەناوبران و بە سزای خۆیان گەیشتن .

( ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ) .. کە چاڵێکی زۆر گەورەو دوورودرێژیان هەڵکەندبوو ئـاگرێکی زور گەورەشـیان تیـاکردبوۆوە بـۆ ئەشـکەنجەدان و سـوتاندنی باوەڕداران .

( إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ ) .. ئەو ستەمكارانە خۆشیان بە دەوری ئەو چاڵە گەورەیەدا بە ریز دانیشتبوون و كۆڕیان بەستبوو .

( وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ ) .. تەماشای دیمەنی سوتانی ئەو خەڵكە موسوڵمانە بێ گوناهانەیان ئەكردو لەزەت وخۆشیان ئەبینی لە بینینی ئەو دیمەنە لانەوازانە .

( وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ) .. هەموو تاوانی ئەو موسوڵمانە باوەڕدارانەش ئەوەبوو كە باوەڕی پتەوو تەواویان هێنابوو بە خوای باڵادەست و ئەو پەروەردگارەیان ئەپەرست كە هەر ئەو شایانی سوپاس و ستایشكردنە .

( ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ) .. ئەو خوایەی كە خاوەنی سەرجەم زەوی و ئاسمانەكانەو هەر خۆشی ئاگای لە هەموو كاروكردەوەو هەڵسوكەوتەكانتانەو دیمەنی ئەشكەنجەدانی ئەو موسوڵمانانەشی باش ئاگالێبوەو لەبیری نەچوّتەوە .. ئەم لاكردنەوەیە لەلایەك دڵنیاییەك ئەخاتە دەروونی موسوڵمانانەوەو لەلایەكی تریشەوە هەڕەشەیەكە بۆ ستەمكارە ملهوڕەكان .

( إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمۡ عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ ) .. ئەو كەسانەی كە بەوشێوە نالەبارە ئازاری ئەو موسوڵمانە پاكانەیانداو پاشان پاشگەزنەبوونەوەو ئەو رەفتارە قێزەونەی خۆیان ریسواو مەحكوم نەكرد ، ئەو تاوانبارانە چارەنووسیان سزاو

ئەشکەنجەی سەختی ناو چاڵ و دۆڵە ئاگرەکانی جەهەنەمە کە سزایەکی سوتێنەری بێ وێنەیە و دەبێتە مۆڵگەو جێگای هەتاهەتاییان .

( إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ) .. ئەو موسوڵمانانەش کە بەو باوەڕە پۆڵاییانەیانەوە کارو کردەوەی چاك و سوودبەخشیان ئەنجامدەدا ، ئەوانە پاداشتیان بریتیە لە ژیانی نەبڕاوەی ناو باخ و ڕەزەکانی بەهەشتی بەرفراوانی خوای پەروەردگار، کە لەژێریاندا جۆرەها روباری سازگارو دڵڕفێن بە بێدەنگی تێدەپەڕێو دڵودەرونیان دەکاتەوە . کە ئەوەش خۆی لە خۆیدا خەڵات و گرەو بردنەوەی دروست و راستەقینەیە بۆ ئەو بەندانەی خوا .

( إِنَّ بَطۡشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ) .. بێگومان تۆڵەسەندنەوەو گورز وەشاندنی خوای باڵادەست زور توندو سەخت و بێ وێنەیەو بەراورد ناکرێت لەگەڵ هەڕەشەو زەبروزەنگی لاوازی خەڵکانی ملهوڕو خوانەناس .

( إِنَّهُۥ هُوَ يُبۡدِئُ وَيُعِيدُ ) .. هەر ئەو خوا گەورەو بەتوانایەیە کە لەسەرەتاوە لەنەبوونەوە بوونەوەرانی دروستکردوەو هەر ئەویش بە ویستی خۆی لەناویاندەباو دووبارەش زیندوویاندەکاتەوە .

( وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ ) .. هەر ئەو خوایەیە کە لێبوردەو بەخشندەیە بەرامبەر ئەو بەندانەی سنوور تێدەپەڕێنن و سەرپێچی فرمانەکانی خوادەکەن و پاشان بەئاگادێنەوەو پەشیمان ئەبنەوەو لەکارە خراپەکانیان بەردەوام نابن ، وە هەر ئەویشە باوەشی خۆشەویستی و میهرەبانی بۆ بەندە بڕوادارو موسوڵمانەکانی ئەکاتەوەو لێیان رازی دەبێت .

( ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ ) .. ئەو خوایەی خاوەن عەرش و شانشینیەکی ئێجگار مەزن و پیرۆزە کە خۆی نەبێت کەس نازانێ چیەو چۆنەو لە چ ئاست و پلەیەکدایە .

( فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ) .. ئەوخوایەی ئەوەندە بەتواناو دەسەڵاتە هەرکاتوساتێ هەرچیەکی بوێ دەیکاو کاتوساتو شوێن سنور بۆ فرمانەباڵاکانی دانانێت . ئەوەش یەکێکە لە سیفەتە جوان و بێ وێنەکانی خوای تاکوتەنها ..

( هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡجُنُودِ ) .. ئایا بەسەرهاتی سەربازەکانت بیستوە ؟

( فِرۡعَوۡنَ وَثَمُودَ ) .. سەربازو لەشکرەکانی فیرعەون و سەموود .. کە خوای گەورە چۆن فیرعەون و لەشکرەکەی لەناوبردو گەلی بەنی ئیسرائیلیشی لەدەست ئەو زۆردارە ملهوڕە رزگارکرد ، وە پێغەمبەر ساڵح و موسوڵمانەکانی دەوروپشتیشی لە ستەمی گەلی سەموود رزگارکردو ئەوانیشی لەناوبرد .

( بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ ) .. بەلأم لەگەڵ ئەمانەشدا کۆمەڵگای بێ باوەڕان و ستەمکاران هەر بەردەوامن لە لاساری و پشتکردنە بەرنامەو ڕێبازە پیرۆزەکانی خوای گەورە و پێغەمبەران و موسوڵمانانیش بەدرۆدەخەنەوە .

( وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ) .. دیارە نازانن کە تواناو دەسەڵاتی خوای باڵادەست لە هەموو لایەکەوە دەورەی داون و قوتاربونیان نیە و ناتوانن لە سنوری دەسەڵاتی ئەو بچنەدەرێ !

( بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ) .. ئــەم راســتی و یاســاو بــەڵێن و بەســەرهات و ڕێنماییانە سەرجەم لە دووتوێی ئەم قورئانە بەنرخ و بەرزەدا تۆمارکراون کە لەلایەن ئێمەوە نێردراوەتە خوارێ .

( فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ) ... وە لــە جێیــەکی زۆر پــیرۆزو بڵنــدو تایبەتــدا پاراستومانە ئەویش ( لوح محفوظ ) ە ...

*　　*　　*

سورەتی ( الطارق )

مەککیە .... حەڤدە ئایەتە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ) .. خوای مەزن لەبەر گرنگی بابەتەکە سوێندی گەورە بە چەند دیمەنێکی ئەم بوونەوەرە ئەخوات و ئەفەرموێ : سوێند بە ئاسمان و بە ( الطارق ) .

( وَمَا أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلطَّارِقُ ) .. کە تۆ هێشتا نازانیت ( الطارق ) چیە ؟!

( ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ) .. ئەو ئەستێرە گەورەو رۆشنەیە کە تاریکی ئەنگوستەچاوی شەوانە دەبڕێ وخۆی ئەخزێنێتە ناو شتەکانەوەو روناکیان ئەکاتەوە .. کەواتە سوێندەکە وای لێدێت : سوێند بە ئاسمان و بەو ئەستێرانەی ناخی تاریکی ئەبڕن و تیشکیان لەپەردەی تاریکی سەر شتەکانەوە ئاودیودەبێ .

( إِن كُلُّ نَفۡسٍ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٌ ) .. سوێند بەو شتانە کە هەر کەس و هەر دەرونێك لەلایەن خوای پەروەردگارەوە چاودێرو پارێزەرێکی تایبەتی بۆدانراوە .. کە هەموو کردەوەو رەفتارێکی هەژمارو تۆمارئەکات و بەفەرمانی خوا لەهەر هۆکارێکی دەرەکی لەکاتوساتی خۆیدا ئەیپارێزێت . تا مرۆڤ تێبگات کە ژیانی لەسەرزەوی بێ مەبەست نیەو بۆ ئامانجێکی بەرز بەدیهێنراوەو ئەرکێکی گەورەی لەسەرشانە .. لە ئەنجامیشدا لێپرسینەوەی لەسەر هەموو کردەوەیەکی زۆر بە وردی لەگەڵدا ئەکرێت ..

( فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ) .. دەسا با مرۆڤ بڕوانێ و بیرکاتەوە و بزانێ لە چی دروستکراوەو چۆن بەدیهێنراوە ؟

( خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ) .. لە جۆرە ئاوێکی ئاوێتەی دەرپەڕیو دروستکراوە .

( يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ) .. کە یەکێکیان لە بڕبڕەی پشتی پیاوەوە دەردەپەڕێ و ئەوی تریان لە پەراسووی سەرەوەی ئافرەتەوە دێتەدەرێ .. ئەم راستیە هێشتا یەکێك بوو لە نهێنیە شاراوەکانی خوای مەزن تا ئەم سەدەی دواییە کە بەهۆی زانسی نوێوە ئەم نهێنیە ئاشکرابوو، کە سەرچاوەی تۆوی پیاو لەو ئێسکانەی پشتێتی و سەرچاوەی هێلکەی ئافرەتیش پەراسوەکانی سینگێتی ـ کە هیچیان بە چاوی ئاسایی مرۆڤ نابینرێن ـ وە دوای بەیەك گەیشتنیان لە منالْدانی ئافرەتداو جێگیربوونی لەوێدا ئەم ئادمیزادەیان لێ پەیدا ئەبێت کە بە چاوی خۆمان ئەیانبینین . خۆ ئەو ماوە دوورودرێژەی لەنێوان هەنگاوی یەکەمی دروستبوونیداو دوایین خاڵی تەواوبوونی مرۆڤدایە .. نێوان ئەودووئاوە سادەو زۆر بچوکەداو نێوان ئەو مرۆڤە ئالۆزەی خاوەن مێشك و هزرەو توانای قسەکردن و بیرکردنەوەی هەیە ، ئەو ماوە درێژەی دەیبڕێت تا دەبێتە ئەو مرۆڤە تەواوە ، نیشانەو بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هێزێکی بەدەر لە مرۆڤ هەیە پاڵ بەم خانە وردە بێدەسەلاتەوە ئەنێت بۆ تەواوکردنی ئەو سەفەرە دوورو سەرسوڕهێنەرەی بۆی دیاریکراوە ..

( إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجْعِهِۦ لَقَادِرٌ ) .. ئەو خوایەی ـ کە دروستیکردو ئاگاداریشی بوو ـ هەر ئەو خوایە تواناو دەسەلاتی ئەوەی هەیە کە دوای مردن و

لەناوچوونیشی دووبارەو بۆ جارێکی تر گیانی بەبەردا بکاتەوەو لەش ولارە مردوەکەی بۆ مەبەستێکی تایبەتیی زیندووبکاتەوە .

( يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ) .. بۆ رۆژێك زیندوو ئەکرێنەوە کە سەرجەم نهێنی و کردەوە نادیارو شاراوەکان پەردەیان لەسەر هەڵئەدرێتەوەو ئاشکرا ئەبن .. هەروەك چۆن ئەستێرە تیشکدارەکان پەردەی تاریکیان ئەبڕی و ئاودیوئەبوون ..!

( فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ) .. جا ئەوکاتە نە خۆیان ئەوەندە هێزو توانایان هەیە کە نەیەڵن نهێنیەکانیان ئاشکرابێ و نە کەسیش بەهانایانەوە دێت و نەیەڵێت رووڕەشی ئەو رۆژەبن .. کە پەردە لەسەر کردەوەکانیان هەڵدەدرێتەوەو گەورەو بچوك و دیارو نادیاری بەرچاوئەکەون و ئەبینرێت .

( وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجْعِ ) .. جارێکی تر سوێند بەو ئاسمانەی هۆن هۆن و تاوتاو بارانی لێدێتە خوارێ .

( وَٱلْأَرْضِ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ ) .. سوێند بەو زەویە رەقەی کە درزی تێدەبێ تا لەناخی سەخت وڕەقیەوە ئەو گیاو روەکە نەرم وسەوزو تەڕوپاراوە بێتە دەرێ .. بڕوانە چ لەیەکچوونێك دەبینرێ لەنێوان ئاسمانێکدا ئاوی بەخوڕ لێبێتە خوارێ و زەویەکیش باوەشی بۆ بگرێتەوە و تێکەڵاوی ببێت . پاشان بوونەوەرێکی نوێیان لێ پەیدا ئەبێ و لەناو زەویەوە سەرهەڵئەداو دێتە دەرێ .. لەگەڵ تێکەڵاوبوونی تۆوی پیاوو هێلکەی ئافرەت کە لە زەوی مناڵداندا ئەڕوێ و بوونەوەرێکی نوێی لێ دێتە دەرێ .. سبحان الله .. هەر تۆ خوای پەروەردگارو باڵادەستی ئەم جیهان و بوونەوەرانەیت ..

( إِنَّهُۥ لَقَوۡلٌ فَصۡلٌ ) .. سوێند بەوانە هەمووی ، ئەوەی وتمان بەگشتی وتەکانی قورئانە و راست ودروستن و هیچ گومان و نادروستیەکی تیانیەو ئەوەی بۆتان رونکراوەتەوە هەق و راستین و وەك ڕۆژی روناك دێتەدی .

( وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ) .. هەروەها مەبەستیشمان گاڵتەو گەپ و کات بەسەربردن و پێ رابواردن نیە .

( إِنَّهُمۡ يَكِيدُونَ كَيۡدًا ) .. ( ئەو خەڵکە کەم تواناو بێدەسەلاتەی لەو تنۆکە ئاوە نەبینراوەوە دروست بوەو خوای گەورە خۆی گیانی ئەکات بەبەرداو ئەیژێنێت و دواتریش هەرخۆی ئەیانمرێنێت و بە ملکەچی لە گۆڕەپانی لێپرسینەوەدا رایان ئەگرێت ) .. ئا ئەو کەسانە دێن و بەرامبەر بەمن پیلان و فروفێڵ ئەنجام ئەدەن و خۆیان لە راستیەکان ئەدزنەوە ..!

( وَأَكِيدُ كَيۡدًا ) .. ئەی نازانن کە منیش نەخشەو پیلانی خۆم هەیەو وا چواردەوریان ئەتەنم بەهیچ کلۆجیك رزگاربوون و قوتاربوونیان بۆ نیە ..!

( فَمَهِّلِ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَمۡهِلۡهُمۡ رُوَيۡدَۢا ) .. کەواتە هیچ پەلەت لێیان نەبێ و بواریان بدەرێ . ئەو بێ باوەڕو گوناهبارو ستەمکارانە چی ئەکەن با بیکەن ، بێگومان ئێمە مەبەستمان هەیە لە دواخستنی تۆڵە لێکردنەوەیان ، با تەمەنی تەواوی خۆیان لە دنیای کەم ماوەی سەرزەویدا ببەنەسەر .. پاشان هەر دێنەوە بەردەستی خۆمان و دەرفەتی هیچ پیلان و خۆدزینەوەیەکیان نامێنێ و بە سەرشۆڕی و ملکەچیەوە لەبەر بارەگاماندا رادەگیرێن ..

* * *

سورەتی ( الاعلى )

مەککیە .... نۆزدە ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ) .. خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات کە هەردەم ناوو یادی پاکی ئەو لەبیرو لەسەر زمانمان بێت و سیفەت و ئایەتە جوانەکانیشی بێنینە بەرچاومان و هەست بە گەورەییان بکەین .. ئیتر لە ویژدانماندا هەست ونەستێکی وا جوان و بەرز دروست ئەبێت کە لەوانەیە نەتوانین بە قسە گوزارشی لێبکەین . بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرکاتێ ئەم ئایەتەی بخوێندایەتەوە ئەیفەرموو : سبحان ربی الاعلى ..

( ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ) .. یادی ئەو خوایە بکەین کە هەموو شتێکی زۆر بە تەواوی و رێك وپێکی دروستکردوەو لەو پەڕی جوانی و قەشەنگیدا بەدیهێناون .

( وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ) .. ئەو خوایەی کە یاساو رێسای تایبەتی بۆ هەر بونەوەرێك داناوەو رۆڵی خۆی لەم بوونەدا بۆ دیاری کردوە .. هەموو ئەو شتانەشی بۆ دابین کردوە کە یاریدەدەری بێت بۆ پیادەکردنی ئەو ئەرکەو ئەو رۆڵەی پێی سپێردراوە .

( وَٱلَّذِى أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ ) .. ئەو خوایەی کە جۆرەها لەوەڕو جۆرەها روەکی بۆ رواندوین ، کە هەرجۆرەی دانراوە ببێتە خۆراکی جۆرێك لەو زیندەوەرانەی خوای مەزن خۆی بەدیهێناون .

( فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ) .. هەر ئەویش ئەیگۆڕیٚ و زەردو وشکی ئەکات ..

لەوەڕ بۆ یەکەم جار کە سەوزو تەڕە ئەبێتە جۆرێك لە خۆراك ، کە زەردو وشکیش ئەبێت دیسانەوە بە ویست و فەرمانی خوای بەدیهێنەر دەبێتە خۆراکی جۆرێکی تر لە زیندەوەران ... بەڵام ئێوەی نادانـاو نەزان ژیانی ئەم دنیایەتان کە وەك ئەو لەوەڕە بەرەو زەردبوون و نەمان ئەڕوات ، ئەو ژیانە کورتە ئەگۆڕنەوە بە ژیانێکی دوورو درێژی نەبڕاوەی پڕنیعمەت و خۆشی و خەڵاتی بەنرخ و گرانبەها ..

( سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ) .. خوای گەورە لێرەدا مژدەیەکی خۆش ئەدات بە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) کە : هیچ غەمی لەبەرکردن و بیرهاتنەوەی ئایەتەکانی ئەم قورئانەت نەبێت ، چونکە ئێمە خۆمان پێت لەبەردەکەین و لەناو مێشك و دڵودەروونتدا ئەیچەسپێنین و هەموو وردو درشتێکیت فێرئەکەین .. هەروەها ئەم ئایەتە مژدە بەخشە بۆ نەتەوەی موسوڵمانانیش کەدڵنیابن لەوەی قورئانەکەیان لەلایەن خوای باڵادەستەوە پارێزراوەو لەناو ناچێت .

( إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ ) .. تەنها ئەوە نەبێت کە خوا خۆی ئارەزووی لێیەو مەبەستێتی و بە ئەنجامی ئەگەیەنێت ، لە هەر کارو بۆ هەر مەبەستێکیشی بوێت ، چونکە خوای پەروەردگار هەرخۆی هەموو شتێکی دیارو نادیارو ئاشکراو نهێنی ئەزانیٚ و ئاگاداری وردو درشتەو هەرئەویش بڕیاریان لەسەرئەداو ئەیان چەسپێنێت .

( وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ ) .. هەر ئێمەش تۆ ئاڕاستە ئەکەین بەرەو ئاسانکاری لە

دەســت ودەم و زمانــت و هــەنگاوەکانت و کــارو کردەوەکانــت و بــیرو بۆچوونەکانیــشت .. ئاســانکاری ئەخەینــە شــێوازی چارەســەرکردنی کــارو فرمانــەکانت ، چ کارەکــانی خــودی خــۆت یــان ئەوانــەی لەگــەڵ خەڵکیــشدا ئەنجامیان ئەدەیت .

( فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ) .. کەواتە هەرکاتێ بۆت رەخساو بۆت هەڵسوڕا راســتیەکانی ژیــان و راســتیەکانی ئــەم ئاینــە بــۆ خــەڵکی روونبکــەرەوەو لایەنــەکانی شــیبکەرەوە .. چــونکە بیرهێنانــەوەی راســتیەکان لەهــەموو کاتوساتێکدا سوودو قازانجی خۆی هەیەو لە هەموو سەردەم و نەوەیەکیشدا کەسـانێك هـەن کـە گوێبیـستی راسـتیەکان بـن بـا تـا رادەیـەکی دووریـش سروشتیان تێکچووبێ و دڵیان رەق و بێ هەست بووبێت .

( سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ) .. دڵنیابە لەوەی ئەوکەسانەی شەرم لە خوای گەورە ئەکەن و لە سزای دواڕۆژ ئەترسن ، ئەوانە دڵیان زیندوەو باش ئەزانن کە ئەم گەردوونــە خوایــەکی تــاك و تــەنهای هەیــەو ئاگــاداری ســەرجەم کــردەوەو چــالاکیەکانی بوونەوەرانــە ، ئەوجۆرەکەســانە زوو بــەخۆ دێنــەوەو رێــی خواناسین و ئیمان ئەگرنەبەرو حساب بۆ دواڕۆژی خۆیان ئەکەن .

( وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ) .. بـەلام ئەوانـەی دڵیـان رەقـەو ، دەروازەی دەرونـی خۆیـان تونـد داخـستوەو گـوێ بـۆ دەنگـی راسـتیەکان شـل ناکـەن و گیانیـان تەنها خولیای رابواردنە کەم و کورتەکانی ژیانی دونیایەو هیچ بیر لە ژیـانی دواڕۆژ ناکەنـەوەو ترسـی لێپرسینەوەی خوایـان لـە دڵدانیـە . ئەوانـە خۆیـان دوورەپەرێز ئەگرن و پشت ئەکەنە سەرجەم ئەم راستیە بەرزو بڵندانە ..!!

( ٱلَّذِى يَصۡلَى ٱلنَّارَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ) .. ئەم تەرزە لە خەڵكی بە سزای سەخت و سوتێنەری ئاگری زۆر گەورەو كڵپەداری جەهەنەم شاد ئەكرێن و ئەوجێگا پڕئێش وئازارە ئەبێتە شوێن و خانەی هەتاهەتاییان ..

( ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ) .. لەو شوێنەیاندا دەرچوونیان نیەو بە نەمری تیایدا ئەمێننەوە . نە ژیانیان ژیانەو نەمردنیان مردنە . نە ئەوەیە بمرن نەئەوەیە بژین !

( قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ) .. ئەوكەسانەش سەرفرازو سەركەوتوو بەختەوەرن كە خۆیان بە پاكی رائەگرن و دڵودەرون و داوێن وخوورەوشتیان خاوێنەو لەكەداری ناكەن بە داوێن پیسی و بەدرەفتاری ..

( وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ) .. ئەوانەی ناوو یادی خوای پەروەردگار هەردەم لەسەر زاریانەو خۆشیان ئامادە ئەكەن بۆ نوێژكردن و دڵ وجەستەشیان ملكەچی فەرمایشتەكانی خوای گەورەیە .. ئەوانە بێگومان رووسپی بەر بارەگای خوای گەورەن و خۆشەویستی پەروەردگاری خۆیانن .

( بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ) .. كەچی ئێوە ژیانی كەم وكورتی دونیای سەرزەویتان پێ باشترو خۆشترە .. كە لەگەڵ هەرخۆشیەكیدا دەیان و سەدان ناخۆشی و ناهەمواری بەدوادادێت و ئەیگۆڕنەوە بە ژیانی پاك و خاوێن و بەرزو بڵندی رۆژی دوایی .

( وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ) .. بەلاَم بێگومان ژیانی رۆژی دوایی باشترو خۆشترو بەردەوام و نەبڕاوەیە .. كە بریتیە لە ژینی پڕ خۆشی و نازو نیعمەتی

هەمیشەیی بەهەشتی پان و بەرین ، ژیانی نزیك خوای خۆشەویست و پێغەمبەرە نازدارەکان و ژن و پیاوانی خواپەرست و رەوشت بەرز .. کەواتە ئەوەی کەمێك ئاگای لەخۆی بێ و مێشکی بخاتەکار هەرگیز خۆشی و بەهرە نەبڕاوەکانی ئەودنیا ناگۆڕێتەوە بە ژیانی نزم و بێنرخی ئەم دنیا .

( إِنَّ هَـٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ) .. ئەو راستیانەی باسکران لەم سورەتەدا . کە هەمووی دەربارەی بنەما بالآکانی بیرو باوەڕو عەقیدەی رەسەن و دێرینی ئیسلامە ، هەمان ئەو راستیانەن کە لە بەرنامەکانی پێشووتریشدا هاتوونەتە خوارێ و چەسپێنراون .

( صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ) .. وەك لە پەڕاوو بەرنامەکانی ئیبراهیم و موساشدا بڕیاردراون و کاریان پێکردوە .. کەواتە ئەمانە بەڵگەن بۆ تاك عەقیدەیی و تاك سەرچاوەیی و هاومەبەستی لە ناردنی پێغەمبەران بۆ ئاگادارکردنەوەی سەرجەم مرۆڤایەتی ، با لە چەند وردەکاریەکیشدا هەندێ جیاوازی هەبێت لەنێوانیاندا ، بەڵام هەرهەموویان لەیەك سەرچاوەیی و یەك مەبەستییدا یەکدەگرنەوە .. کە هەموویان لەلایەن یەك خوای تاك و تەنهای بالآدەست و بێ هاوتاوە نێردراون و کراونەتە بەرنامەی ژیان بۆ مرۆڤایەتی لە هەموو سەردەم و قۆناغەکانی ژیانیدا ...

* * *

سورەتی ( الغاشیة )

مەککیە .... بیست وشەش ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ) .. ئایا باسی ( الغاشیه )ت بیستوه ؟.. کە یەکێکە لەناوەکانی رۆژی قیامەت و بەمانای کارەساتێکی سامناکی وایە کەدڵودەرونی خەڵکیی هەمووی ترس و لەرز دایدەگریْ و ئەیان تۆقێنێت ! خوای گەورە لێرەدا ئەیەویْ ئادەمیزاد ئاگاداربکاتەوەو بیر لە ئایات و موعجیزەکانی بکەنەوە . هەر بەم بۆنەیەوە ئەگێڕنەوە پێغەمبەر (ﷺ) جارێك بەلای ئافرەتێکدا تێئەپەڕیْ کە ئەم ئایەتەی ئەخوێند : ( هل أتاك حدیث الغاشیة ؟ ) ئەویش هەڵوێستەیەك ئەکات و ئەفەرمویْ : بەڵیْ ، بەڵیْ بیستوومە ..

( وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ) .. لەو رۆژەدا زۆرێك دەم وچاویان تێك ترشاوەو سەریان شۆڕەو ماندوو شەکەت دیارن .. بەوەی کە ئەو هەموو هەولْ و کۆششەی دنیایان مایە پووچ بوەو لێرەش شتێکی وایان دەستناکەوێت دڵیان پێی خۆش بیْ و شەرمەزارنەبن ، ئەوەی ئەیبینن هەر قوڕبەسەری و مالْ وێرانیە .

( عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ ) .. هەوڵیان داوەو ماندووش بوون .. بەڵام بۆچی؟ بۆ کیْ..؟ بۆ تێرکردنی ئارەزوە نزمەکان ! یا تەنها بۆ رازیکردنی مالْ ومنالْ ! بەڵام لە پێناوی خواو بۆ رەزامەندی خوای خۆی هیچی نەکردبوو .. بۆیە لە دنیاشدا

هەر ماندوو ئەبوو ، بە هیچ دانەئەمرکایەوەو تێرنەئەبوو . لە رۆژی دواییشدا هەر رووڕەشی و بێ بەشی و ماندوێتی و ئێش و ئازار بەشێتی !

( تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ) .. نەك هەرئەوە بەڵکو فڕێ ئەدرێنە نێو ئاگرێکی گڕو کڵپەداری ئێجگار گەرم و سوتێنەری سزادەرەوە ..

( تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٍ ) .. بە جامێك ئاو ئەکرێت بەدەمیانەوە کە لە گەرمیا وا داغ بوە و سووربۆتەوە ئەڵێی لە خودی ئاگرەکە خۆی گەرمترە .!

( لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ) .. ئەوانە لەو جێیەدا خواردنیان تەنها جۆرە دارو گەڵاو روەکێکی تاڵ و ژەهراویە پێی ئەوترێ ( ضريع ) ، کە وەك پێخۆر لەگەڵ کێم و زەرداوی برینەکانیاندا ئەیاندرێتێ !

( لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٍ ) .. بێگومان ئەو جۆرە خواردنە هیچ برسێتیان ناشکێنێ و دەرونیان دانامرکێنێ و هەناوی گڕگرتوویان فێنك ناکاتەوەو هەر ناڵەناڵیانە !

( وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ) ..لەبەرامبەر ئەوانەشدا کەسانێکی دی هەن کە زۆر رووگەش و رووخۆشن .

( لِّسَعۡيِهَا رَاضِيَةٌ ) .. سەراپا سەرفرازی و رەزامەندیان لێدەباریێ سەبارەت بەو هەوڵ و کۆششەی داویانە لە ژیانی پێشویاندا .. وە سوپاس و ستایشی ئەو خوایە ئەکەن کە ئەو خەڵات و پاداشتە زۆرو نیعمەتە بێ وێنەیەی پێ بەخشیون لە پاداشتی کردەوە چاکەکانی ژیـنی دونیایاندا و لەبەرامبەر ئەوەی شوێن کەوتووی بەرنامەو ئاینی پیرۆزی خوای پەروەدگاریان بوون .

( فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ) ..ئەوانە جێیان بەهەشتی بەرزوبڵندو و پان و بەرین و فراوان و رازاوەی خوای گەورەومیهرەبانن .

( لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةً ) .. بەهەشتێکە خاموش و بێدەنگە ، هیچ جۆرە دەنگ و رەنگێکی نامۆو نەشازی تیا نابیسترێ و نابینرێ کە خوانەخواستە هەست و نەستی میوانە بەڕێزەکانی پێ بریندار ببێت !

( فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ) .. ئەو بەهەشتە چەندەها کانیاوی شیرینی تیایە کە بەخوڕ ئاوی لێ دێتە دەرێ .. بە دیمەنە جوان و دڵگیرەکانی سەرنجی بینەرانی رائەکێشێ و دەرونیان پێی ئەحەوێتەوەو چاویان پێی تێرئەبێ .

( فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ) .. جێی حەوانەوەیان سیسەمی شوێن بڵند و پاکوخاوێنە ، بەتایبەت بۆ ئەوان تەرخانکراوەو کەسی تر بۆی نیە بەکاریان بهێنێت .

( وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ) .. کاس و پەرداخی خواردنەوەیان زۆر بەجوانی ریزکراون و بەبێ داواکردن و هێنان و بردن ئامادەو سووکەدەستە بۆیان .

( وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ) .. سەرین و بالیفە نەرم و نیانەکانیان لەنزیك خۆیانەوەیەو بۆ بەکارهێنان حازرو ئامادەیە .

( وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ ) .. مافورو رایەخە جوان و رازاوەکانیش لە هەر چوارلاوە راخراون و دەوروپشتیانی دڵگیرو قەشەنگ کردوە .

( أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ) .. ئەی بۆ ناڕواننە ئەو وشترانەی

دەورو بـەریان و بەچـاوی دانایـیـەوە بیربکەنـەوە کـە ئـەو ئاژەڵانـە چـۆن دروسـتکراون و کـێ دروسـتیکردوون و بۆچـی و بـۆ چ مەبەسـتێك دروستیکردوون ؟

( وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ) .. یـا ئـەو ئاسمانانـە چـۆن وا بـەرزو بڵنـد ڕاگیراون و بەچی ڕاگیرکـراون و کـێ بـەو بەرزیـەوە و بـەبێ ستوون و بـەبێ کۆڵەکە ئاوا ڕایگرتوون ؟ .

( وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ) .. ئـەی ئـەو چـیاو کێـوو شـاخانە کـێ بەدیهێناون و کێ وا لەو زەویـە ڕەق وتەقە چەقاندونی و بۆ چ مەبەستێك وا لەناخی ئەو زەویەدا چەسپێنراون ؟

( وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ) .. یـا ئـەو زەویـەی لەسـەری ئـەژین ، بابزانن بۆچی وا تەخت کراوەو ڕامکراوە بۆ سوودو کەڵك لێوەرگرتنی مرۆڤ و چی لەناخیدا دانراوەو بۆچی بۆی داناون ؟

( فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ) .. دەسا گەر ئەتەوێ بیرو یـادی خـوا بکەیتـەوە . هـەروەها وەك ئـەرکێکی سەرشـانی خـۆت ، بـڕۆ لەگـەڵ ئـەو خەڵکـە بـدوێ و ئایەتـە بەرزو بەنرخەکانی خـوای پـەروەردگاریان بـەبیر بێنـەوە .. ئەوەشـیان فێربکـە کـە دوای مردنیـان لێپرسـینەوە هەیـەو پاداشـتێکی مـەزن یـاخود سزایەکی سەخت چاوەڕێیان ئەکات و دەربازبوونیان نیە لێی !

( لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ) .. هـەر ئەوەنـدەش بەسـە کە بەشێوازێکی جوان و شـیاوو ڕێکوپێـك و بـێ گـرێ تێیـان بگەیـەنیت و ئـەو ڕاسـتیانەیان بـیر بخەیتەوە، چونکە تۆ هەرئەوەندە دەسەڵاتت هەیە .. ئـەوی تـر لەسـەر خـوای

پەروەردگاریانەو دڵودەرونی بەندەکانی خوا لەنێو دەستی خۆیەتی و لە نێوان هەردوو پەنجە پیرۆزەکانی خۆیدا دێن ودەچن !

﴿ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴾ .. ئەوانەش کە هەر سوورن لەسەر گومڕایی و نەفامی و ملهوڕی و گوناهکاری و بێ باوەڕی .

﴿ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴾ .. ئەوانە خوای مەزن سزای زۆر سەخت و دژواری بۆ ئامادەکردوون و دواڕۆژێکی رەش و تاریك چاوەڕێیان ئەکات ..!

﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴾ .. بێگومان ئەوان و هەموو مرۆڤایەتیش هەر بۆلای ئێمە ئەگەڕێنەوەو هیچ بارەگاو خانەیەکیان نیە جگە لە بارەگای من و جگە لە گۆڕەپانی لێپرسینەوەی پەروەردگاریان نەبێ !

﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴾ .. جا ئەو کاتە لێپرسینەوەو دادوەریان هەر تایبەت بە ئێمەیەو نە تۆو نەکەسی تر بەرپرسیارنین و خەتابارنین لە رەوشت و رەفتارو کردەوەکانیان ...

* * *

سورەتی ( الفجر )

مەککیە ....سی ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( وَٱلۡفَجۡرِ ) .. سوێند بەکاتی بەرەبەیان .. ئەو ساتەی گەردوونی زیندە بەو پەڕی هێمنی و رووی گەشیەوە هەناسەی بێدەنگی خۆی ئەدات . کە بوونەوەرانی خەواڵوو وردەوردە لەگەڵیدا بەئاگادێن و بێدارئەبنەوە و بەزمانحاڵی خۆیان سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگاریان ئەکەن ..!

( وَلَيَالٍ عَشۡرٍ ) .. سوێند بەو دە شەوەی لای خوای پەروەردگار پیرۆزو بەفەڕو بەنرخ وخۆشەویستن ، کە لەبەر گەورەییان سوێندیان پێ ئەخواو هەڕەشەی پێ لە ملهوڕان و ستەمکاران دەکات .

( وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ) .. سوێند بە نوێژە جووتەکان و نوێژە تاکەکانیش .. ئەو نوێژانەی لە بەرەبەیان و لە شەوە پیرۆزەکاندا بەندە دڵسۆزەکانی خوا ئەنجامیان ئەدەن و دڵی خوای خۆیانی پێ خۆشئەکەن و ڕەزامەندی ئەوی پێ بەدەست دێنن .

( وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ ) .. سوێند بەو شەوگارە زیندووەی بەم گەردونەدا دێ و دەچێ و تاریکی و بێدەنگی پەخشدەکات بەسەر بوونەوەراندا .

( هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ ) .. ئەی ئایا ئەو هەموو سوێندە بەس نیە بۆ دڵنیابوون و گومانبڕینی ئەوکەسانەی خۆیان بە تێگەیشتوو خاوەن بیرو

هۆش کەڕانەنێن و داناو زانان ؟ ..

( أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ) .. ئەی نابینی خوای بالاّدەست و پەروەردگارت چی کرد بە نەتەوەی (عاد) .

( إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ) .. ( عادی ئیرەم ) کە ڕەشماڵەکانیان کۆڵەکەو نێرگەی ئێجگار بەرزو بڵندیان هەبوو تا ئەو ڕەشماڵە زەبەلاح و پان و بەرینانەیان بۆ ڕابگرێت . .

( ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ ) .. لەو سەردەمەدا و لەو ناوچەیەدا خوای گەورە کەسی تری وەك ئەوان دروست نەکردبوو .. هیچ نەتەوەیەکیش شانی نەئەدا لەشانیان و هەرخۆیان سەردارو بەناوبانگ بوون ..

( وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ ) .. نەتەوەی ( سەموود) یش کە لە ناو دۆڵەکانەوە زۆر بە وردەکاری ئەو بەردانەیان دەرئەهێناو کۆشك وتەلاری جوان و ڕازاوەو چەند نهۆمییان بە بەردی گەورە دروستکردبوو .. هەروەها هەر ئەوان بوون کە ناو کێوەکانیان کۆڵیبوو وەك تونێل و ئەشکەوتی گەورەو بەکاریان ئەهێنا بۆ خۆشاردنەوەو خۆپاراستن لە کارەسات و لە دوژمنانیان..

( وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ ) .. وە فیرعەونیش کە خاوەن نێرگەو ستوونی زۆر گەورەو زەبەلاح بوو .. لێرەدا مەبەستی لە فیرعەونی کاتی موسایە ، کە سەرکردەیەکی ستەمکارو زۆردارو ملهوڕو خوانەناس وخوێن مژو داوێن پیس و کەم وێنە بوو لە بەدکاری و بەدڕەوشتی و دڕندەیی و خوێن مژییدا .

( ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ) .. ئەو نەتەوەو سەرکردەو شوێنکەوتوانەشیان

سەرجەم بەهۆی خۆ بە گەورە زانین و دڕندەییانەوە کەوتبوونە بەدکاری و ملهوڕی و ستەمکاریەوە .

( فَأَكۡثَرُوا فِيهَا ٱلۡفَسَادَ ) .. وە خراپەکاری و بەدڕەفتاریەکی زۆر نەگریس و بێ پەردەیان بڵاو کردبوۆوە .. بێگومان خۆ بەگەورە زانین و لوتبەرزی سەرکردەو دەسەلاتدار ، خۆشی و ژێردەستەکانیشی تووشی خراپەکاری و بەدڕەوشتی دەکات و پەیوەندیەکانی نێوانیان تێکدەچێ و لە راستەڕێی مرۆڤایەتی دەرئەچن و، سەرکردەی ملهوڕ دەبێتە دیلی ئارەزوە نەخۆشەکانی و چاوە زەقەکانیشی خۆی نەبێت کەسی تر نابینێ و لەوانەیە بگاتە پلەیەك لە سەرخۆشی و مەستیی لەخۆڕازیبوون ، کە بڵێت من خوای ئێوەم و کەسی تر جگە لەمن بە خوای خۆتان نەزانن ..!!! ـ کە ئەمەیان گەورەترین و بێ سنوورترین بەدکاری و تێکچوونی یاساکانی بەندایەتی مرۆڤە لە ژیانیدا ـ ئیتر دوای ئەوە ئەو سەرکردە ستەمکارە وای لێدێت بە چاوی بەندایەتیەوە سەیری جەماوەرەکەی ئەکات و زۆرخراپ ئەیان چەوسێنێتەوە ، ئەوانیش لە کاردانەوەی ئەم بارەو لەدرێژیی ژیانی ژێردەستەیی و سەرشۆڕیدا ، سروشت و رەوشتیان تێکدەچێ و لێهاتووییان نامێنێ و دەرون و ویژدانیان رەق و خراپ و بۆگەن ئەبێ و دواتر ئەوانیش دەست ئەکەن بە خراپەکاری و مافی یەکترخواردن و ستەم لە یەکترکردن .. بەو پێیە خراپەکاری لە هەموو لایەك و کونج و کەلەبەرێکدا تەشەنە ئەکاو بەبێ سڵ لێکردنەوە لە نا ئەو کۆمەڵگایانەدا بڵاو ئەبێتەوە ..!!

( فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ) .. ئەو کاتە خوای گەورە سزاو ئەشکەنجەیەکی سەختی بەسەردا بارانن و چیتر مۆڵەتی نەدان و تۆڵەی

لێ سەندنەوە .. دوای ئەوەی خوای گەورە زۆر ئارامی لەسەرگرتن و زۆریش ئاگاداری کردبوونەوەو ترساندبوونی ، بەڵام ئەوان هەرسووربوون و بەردەوام بوون لەسەر ئەو رەفتارانەیان ..

( إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ) .. دڵ لەدڵ نەدەن و دڵنیابن لەوەی کە خوای بالادەست ئاگای لە هەموو شتێکەو لەکاتوساتی خۆیدا دێتەناو رووداوەکانەوەو ئەوەی مەبەستی بێ و بە باشی بزانێت بە ئەنجامی ئەگەیەنێت ..

( فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ) ..

زۆرجار بیروبۆچوونی مرۆڤ کورتبینەو بەئاوەژوو لە رووداوەکان تێدەگات ، بۆیە خوای گەورە لێرەدا وەسفی ئەکات و ئەفەرموێت : ئەوەتا مرۆڤ کاتێ خوای خۆی هەر بۆ تاقیکردنەوە نازونیعمەتێکی باشی بەسەردا ئەرێژێو ماڵوسامان و پلەو پایەیەکی چاکی ئەداتێ ، ئەو کابرایە بەهەموو ئەقڵیەوە ئەڵێ: خوا منی خۆشویستوەو رێزی لێناوم و لێم رازیە .. ئەگینا بۆئەم هەموو شتەم ئەداتێ ..!

( وَأَمَّا إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ) .. هەر هەمان مرۆڤ کاتێ کە خوای گەورە بەشێوەیەکی تر تاقی ئەکاتەوە و ماڵوسامانی ناداتێ و دەرگای رزقی لێ تەسك ئەبێتەوەو کەس وکارو پلەو پایەی نابێ ، لەوکاتانەدا ئەڵێ : خوای گەورە منی خۆش ناوێ و رقی لێمە و تۆڵەم لێئەکاتەوە .. ئەگینا بۆ وا لەناو ئەو هەموو خەڵکانەدا هەر منی ئاوا هەژارو داماوکردووە..؟!

( كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ ) .. نا ، نەخێر .. کێشەکان هەرگیز وانین کە ئێوە لێیان تێ ئەگەن . تەنها ئەو کەسانەی کە دڵودەرونیان بە ئیمان و باوەڕی پتەو ئاونەدرابێ و متمانەی تەواویان بە خوای خۆیان نەبێ ، تەنها ئەو جۆرە مرۆڤانە وا هەست ئەکەن کە ماڵوسامانی زۆر نیشانەی ڕەزامەندی خوایە لێیان ، یاخود هەژاریو دەستکورتیی مانای ریسواکردن و تۆڵە سەندنەوەیە لەلایەن خوای گەورەوە .. بەلاّم لە راستیدا هۆکارەکان هەر خۆتانن .. ئەوەتا ئێوە هیچ لاناکەنەوە بەلای ئەو منالە هەتیوو بێ باوك و بێ نازانەداو دەستی یارمەتی و چاودێریان بۆ راناکێشن و ئاگاتان لێیان نیە کە لە چ حالێکدان ..

( وَلَا تَحَـٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ) .. لەناو خۆشتانا یەکتری هانناەدەن بۆ یارمەتی دانی هەژارو داماوەکان و رۆزی و ئاووخواردنیان بۆ دابین ناکەن و پشتگوێتان خستوون .

( وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ) .. ئێوە وا هەرخەریکی هەڵپەکردنن بۆ خواردنی ماڵی میراتی و خەمی کۆکردنەوەی ئەو میراتانەتانە .

( وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا ) .. نەك هەرئەوە ، بەڵکو پارەو ماڵوسامانتان زۆر خۆشئەوێ و شەوو رۆژ هەر لە خەیاڵی ئەودان .

( كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ) .. نەخێر .. چاوەڕێی رۆژێك بن کە ئەم زەویە جوان و رێك و پێکە چۆن تەخت ئەکرێ و هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ .

( وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ) .. یا کاتێ کە خوای پەروەردگارو سەرجەم فریشتەکانیش بەڕیز بەدوایدا دێن و لەبەردەمیا بە بێدەنگی ڕائەوەستن .

( وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَـٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ) .. هەر لەو ڕۆژەشدایە کە ئاگری جەهەنەم بەوپەڕی ئامادەباشییەوە چاوەڕێی فەرمانی باڵای خوای پەروەردگار ئەکاو ئامادەیە بۆ بینینی ئەو ڕۆڵەی پێی سپێردراوە . ئالەو ڕۆژە ناهەموارەدا ، کە کار لەکار ترازاوە ، ئەو کەسانەی لەوەوپێش باسیان لێکرا ، تازە بەخۆ دێنەوەو بیر لە ڕابوردووی خۆیان ئەکەنەوە و ئەیانەوێ بێنەوە سەر ڕێی ڕاست و ڕووبکەنەوە لای خوا ..! بەڵام ئەوانە خەیاڵیان خاوەو ئیتر هیچ شتێ فریایان ناکەوێ و هیچیان پێناکرێت .

( يَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى قَدَّمْتُ لِحَيَاتِى ) .. بەهەناسەی ساردو ئاخ وئۆفەوە ئەڵێت : بریا سەدبریا هەرنەبێ شتێکم بۆ ئەم ڕۆژەم بکردایەو خەمێکم لێبخواردایە .. چونکە هەر ژیانی ئێرە ڕاستەو خۆشیەکانی بەردەوام و بەسوودن .

( فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ) .. بەڵام ئیتر تەنها هەر سزای سەخت و توندی خوای گەورە چاوەڕێی ئەکات ، سزایەك کە ئەو نەبێت کەسی تر سزای وای نیەو نەیانزانیوە .

( وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ) .. بە جۆرێکیش قۆڵبەست و پێوەندیان ئەکات کە کەس نەیدیوەو نایزانێت .

( يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ) .. ( دوای ئەو هەڕەشەو ترساندنە خوای

گه‌وره رووئه‌كاته‌وه دڵوده‌رونه رۆشن و زیندوه‌كان )و ئه‌فه‌رموێت : ده‌سا ئه‌ی ده‌رونی ئارام و دڵنیا .

( ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ) ..ئیتر به‌سه‌و بگه‌ڕێوه باوه‌شی په‌روه‌ردگاری میهره‌بان و به‌سۆزی خۆت .. بگه‌ڕێوه‌و بێ خه‌م به له‌وه‌ی كه خوا لێت رازیه‌و به به‌خششی خۆی ڕازی‌و ئاسووده‌ت ئه‌كات له ناو به‌هه‌شته پان وبه‌رینه‌كه‌یدا .

( فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ) .. دوای ئه‌وه‌ی دڵنیا بوویت و ره‌زامه‌ندی خوای گه‌وره‌ت به‌ده‌ست هێنا ، بڕۆ ریزی به‌نده دڵسۆزه‌كانمه‌وه .

( وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ) .. له‌گه‌ڵ ئه‌واندا خه‌ڵاتی خوای په‌روه‌ردگات وه‌رگره‌و ببه میوانی هه‌میشه‌یی به‌هه‌شتی جوان و رازاوه‌ی خوای به‌خشنده‌و میهره‌بان ..

*　　*　　*

سورەتی( البلد )

مەککیە .... بیست ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحيم

( لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ) .. خوای گەورە ئەفەرموێت : سوێند ناخۆم بەم شارە .. کە شاری مەککەیە و ماڵی خوایەو پیرۆزو پارێزراوە ، یەکەمین ماڵیش بوو لەسەرزەویدا کە بۆ پەرستنی خوای پەروەردگار تەرخانکرا . لە تایبەتمەندیەکانیشی ئەوەبوو : نابێ شەڕو کوشتاری تیابکرێ و دارو دەوەنی هەڵبکەنرێ و ئاژەڵ و باڵندەی راوبکرێ .

( وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ) .. هەروەها تۆش ئەی پێغەمبەر لەم شوێنە پیرۆزەدا نیشتەجێیت . کە جێگاکە زیاتر بەفەڕترو پیرۆزتر ئەکەیت .. ئەمەش بیرخستنەوەی بێ باوەڕو دوژمنانێتی تا شەرم بکەن و چیتر ئازاری نەدەن و رێی بڵاوکردنەوەی دینەکەی لێنەگرن ..

( وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ ) .. هەروەها سوێند بەو باوك و کوڕەی لێرەدا ژیان و پلەوپایەیەکی تایبەتییان هەبوو لای ئێمە .. کە مەبەستی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕیەتی . یاخود لەوانەیە بەگشتی مەبەستی لە هەموو باوك و کوڕێك بێت کە ئاماژەیە بۆ لەدایکبوون و نەوەخستنەوەی نوێ و بەردەوام بوونی وەچەی مرۆڤایەتی .

( لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ) .. بزانن کە ئادەمیزادمان بۆ ماندووبوون و هەوڵدان و کۆششکردن دروستکردوە .. ئەوەش زەرەرمەندو مایەپووچە کە

لەدنیادا ئەو هەموو ماندووبوونە ببینیٚ و پاشان لە دوای مردنیشی تووشی شەکەتی و ئەشکەنجەیەکی زۆرو بیٚ کۆتایی ببێتەوە .

( أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ ) .. دیارە وای داناوە کە کەس پێی ناوێریٚ و کەس ناتوانیٚ لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات .. لەسەر ئەو بەدکاری و بەدڕەفتاریانەی کە ئازاری کەسانی تری پێئەداو ئارامی و هێمنی ژیانیانی ئەشێواند .

( يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالاً لُّبَدًا ) .. یا لەوانەیە بڵیٚ ئەریٚ خۆمن پارەو ماڵوسامانێکی زۆرم بەملاو بەولادا خەرج ئەکرد .

( أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُ أَحَدٌ ) .. دیارە وای دانەناوە کە یەکێك بینیبێتی و ئاگای لە هەموو کارو کردەوەکانی بووبێت و هەرهەمووی هەژمارکردبێت و تۆماری کردبن بۆ کاتوساتی دیاریکراوی خۆی ؟ ..

( أَلَمْ نَجْعَل لَّهُ عَيْنَيْنِ ) .. ئەی نازانیٚ هەر ئێمەین کە دوو چاوی ساغ و هەستیارمان داوەتیٚ بۆ بینین و دیدەڕۆشنی ؟ ..

( وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ) .. زمان و دەم و لێومان داوەتیٚ بۆ گفتوگۆو دەربڕینی هەست و نەست و خواستەکانی ژیانی .

( وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ ) .. وە تواناو بیروهۆشی ئەوەمان داوەتیٚ کە ڕێڕەوو بەرنامەی ژیانی خۆی هەڵبژێریٚ و جیاوازی بکات لە نێوان ڕێگای بەختەوەری و سەرفرازی و خۆشیی نەبڕاوەی بەهەشتەکان و نێوان ژیانی دنیاویستی نزم و شوێنکەوتنی بەرنامە کورت بینەکانی مرۆڤ بۆ ژیان

بردنەسەر لەم تەمەنەکورتەدا .. کە سەرجەم ئەو عەقیدەو بەرنامانە سەرەڕای ئەوەی چەواشەکردن و لادان لە ڕێی ڕاستی تێدایە ، ئاکام و ئەنجامەکانیشی خوا لەخۆ ڕەنجاندنەو ڕووڕەشی و سەرشۆڕیی ڕۆژی قیامەتیشی لەدوایە .

( فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ) .. ئەو کۆسپ و بەربەستانەی لە ڕێی گەیشتن بە ڕەزامەندی خوادایە ئەبێ بیانبڕن و تەخت بکرێن بۆ گەیشتن بە ئامانجە بەرزەکان . بۆ گەیشتن بە بەهەشتی پان و بەرین . بۆ ڕزگاربوون لە سزای سەختی دۆزەخ .

( وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ) .. کە تۆ نازانیت ئەو کۆسپ و بەربەستانە چین و چۆنن ؟ .. ئەمەش بۆ ئەوە نیە کە کێشەکە بەگەورەو ترسناك بێنێتە پێش چاوی ئادەمیزاد ، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە لای خوای باڵادەست زۆر گەورەیەو بڕینیان ئەنجامێکی باشی لێ ئەکەوێتەوەو مرۆڤ سەرفرازو سەرکەوتووی دنیاو قیامەتیش ئەکات .

( فَكُّ رَقَبَةٍ ) .. یەکێك لەو کۆسپ و بەربەستانە ، ئازادکردنی مرۆڤێك لە بەندەیی و کۆیلایەتیە . یاخود بەشداریکردن لە ئازادکردنیدایە ، کە جگە لە ماڵ و پارە هەوڵ وکۆششی ئەوێت .

( أَوْ إِطْعَـٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ) .. یاخود تێرکردنی خەڵکە دەستکورت و برسیەکان لەو ڕۆژگارانەی کە برسێتی و قاتوقڕی بڵاو ئەبێتەوە .. کە نەك نانێك بەڵکو پارچە نانێکیش زۆر خۆشەویست و بەنرخ ئەبێت لای خەڵکیی .

( يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ ) .. یان یارمەتیدان و دەست بەسەراهێنانی هەتیوە بێ باوکەکان بەتایبەتی گەر خزم و کەسوکاری مرۆڤ خۆی بێت .. کە لەو

کاتەداو لە زۆربەی سەردەمەکاندا هەتیوە بێ نەواکان زۆربەی کات بێنازن و کەمتر لائەکرێ بەلایانەوە .!

( أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ) .. یا هەژارێکی داماوو برسی کە لە برساناو لە بێ هێزی خۆیدا بە زەویەوە نوساوەو توانای جوڵەی نەماوە .. جا ئەو دوو کۆسپ و هەنگاونانە ــ کە لە کۆمەڵگای ئەوکاتەدا بەتایبەتی و لەهەموو سەردەمێکدا بەگشتی باوبوون ــ زۆر گرنگبوون بۆ بڕینیان و بازدان بەسەریاندا بۆ گەیشتن بە ئامانج و ئاواتە بەرزەکانی ژیان .

( ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْمَرْحَمَةِ ) .. پاشان ئەو جۆرە کەسە ئەبێ لەو موسوڵمانانە بێت کە باوەڕ چەسپیوو هاندەر بێت بۆ ئەنجامدان و بلاْبوونەوەی چاکەو کاری خێرو سوودبەخش ، هەروەها هاندانی یەکدیش بۆ بەخشینی سۆزو بەزەیی لەناو کەس وکار و ئەندامانی کۆمەڵدا .. تا ببێتە ئاڵاو مۆرکێکی جیاکەرەوەی کۆمەڵگای موسوڵمان لەنێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا .

( أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ) .. ئەوکاتە ئەو دەستەیە لە خەڵکانی باوەڕدار بەختەوەرن و خاوەن ژیانێکی ئاسوودەو بەهرەمەند ئەبن و لەگەڵ ئەو خەڵکانە زیندوو ئەکرێنەوە کە بڕوانامەی کردەوەکانیان ئەدرێتە دەستی راستیان و مژدەی رەزامەندی خواو چوونە ناو بەهەشتیان ئەدرێتێ .

( وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا هُمْ أَصْحَـٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ) .. بەلاْم ئەوانەی باوەڕیان بە ئاین و بەرنامەو ئایەتەکانی ئێمە نەبوو .. وە نەفامی و بەدکاریان کردوە بە ئاڵاو مۆرکی خۆیان و ناچن بەلای چاکەو کاری خێردا .. ئەوانە روویان

ڕەشــەو غــەمبارن بــەوەی کــە بڕوانامــەی کــردەوە خراپــەکانیان بــە دەســتی چــەپیان وەرئــەگرن و لــە نــاو گۆڕەپــانی مەحــشەردا ملکــەچ و سەرشــۆڕو پەشیمانن .

( عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ ) .. نــەك هــەر ئــەوە بــەڵکو ئەوانــە ئــاگری بــەتین و ســوتێنەری دۆزەخ ، کــە هــەردەم گــڕو کڵپــەی دانامرکێتــەوە ، ئــەو ئــاگرە ئـەکرێت بەســەریانا کــە گۆشــت و ئێسکیان وەك یــەك دائــەڕزێنیّ و ئـیتر بـۆ هەتاهــەتایی دەرچوونیان نابێـت لەناو ئـەو سـزاو ئەشـکەنجە سـەخت و بـیّ وێنەیــەدا ...

*		*		*

سورەتی ( الشمس )

مەککیە ....پانزە ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

خـوای گـەورە لـەم سـورەتەدا سـوێند بـە چـەند دیاردەیـەکی گـەردوونیی دەخوات تا ڕۆڵ و گرنگیان دەربخات لەم بوونەدا و ئەفەرموێ :

( وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا ) .. سـوێند بـە خـۆرو بـەو روناکیـەی لـە سـەرەتای بەرزبوونەوەیدا پەخشی دەکات .. روناکیەکەی لە کاتی چێشتەنگاودا کە سەرەتای بەرزبوونەوەیەتی لە ئاسماندا دیمەنێکی دەگمەن و ئاوێزەیەو لە جوانترین کاتیدایە .

( وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ) .. سـوێند بـەمانگیش کـە پـاش ئـاوابوونی خـۆر دەردەکـەوێ و روناکیـەکی کـەمترو سـەرنج ڕاکـێش لەگـەڵ خۆیـدا پەخشدەکات.

( وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ) .. سـوێند بـەو ڕۆژە روناکـەی سـەرجەم بوونـەوەر روناکدەکاتەوەو پەردەی تاریکیان لەسەرهەڵدەماڵێت .

( وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰهَا ) .. سوێند بەو شەوەی پـەردەی تـاریکی خـۆی ئـەدات بەسەر هەموو شتێکداو لە چاو بزریان دەکات .

( وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ) .. سـوێند بـەو ئاسمانـەی خـوای گـەورە زۆر بـە تۆکمەیی دروستی کردوەو ئەو هەموو ئەستێرە جوان و پرشنگدارەی تیا

بلاوکردوەتەوە .

( وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ) .. سوێند بەو زەویەی تەخت و سانای کردوە .. تـا مرۆڤ و سـەرجەم بوونەوەران ژیانی لەسەر ببەنەسەرو وای ژێردەستەکردوە بۆیان کە بگونجێت لەگەڵ ئەو رۆڵەی پێیان سپێردراوە .

( وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ) .. سوێند بەو دەرونەی بەتەواوی و بێ کەموکوڕی دروستیکردوەو بەدیهێناوە

( فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ) .. پاشان هەردوو رێگای ژیانی پیشانداوەو زانیاری ئەوەی داوەتێ کە کامیان هەڵبژێرێت ئەیگەیەنێتە سەرفرازی و ئەوی تریشیان بەرەو هەڵدێرو نشێوی دەیبات .

( قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ) .. جا ئیتر هەرکەسێ رێگا خاوێن و راست و رەسەنەکە هەڵبژێرێو پابەندی رێنماییەکانی خوای پەروەردگاری خۆی بێت لەو رێبازەیدا ئەوا بێگومان سەرکەوتووی هەردوو دنیایەو سەرفرازو ئاسوودەش دەبێت .

( وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ) .. بە پێچەوانەشەوە ئەوەی لەو رێبازە راستە لابداو رێگای لارو خوار هەڵبژێرێ و پابەندی ئارەزوەکانی خۆی بێت نەك رێنماییەکانی خوای پەروەردگار ، ئەوا هەرخۆی دۆڕاوو شکست و گیرخواردووی هەردوو دنیا دەبێ .

( كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِطَغۡوَىٰهَآ ) .. ( لێرەدا باسی بەسەرهاتی گەلی سەموود دەکات لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا ) و ئەفەرموێ : گەلی سەموود بەهۆی

لوتبەرزیو ستەمکاری خۆیانەوە یاساو بەرنامەکەی ئەو پێغەمبەرەیان بەدرۆخستەوەو پشتگوێیان خست .

( إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا ) .. کاتێ کەللەڕەقترین کەسیان دەستنیشان کردو ئەنجامدانی ئەو کارە خراپ و نەگریسەیان خستە ئەستۆی ، ( کە بریتی بوو لە کوشتن و ورگ هەڵدڕینی ئەو وشترەی کە خوای گەورە وەك موعجیزەیەك لەو ناوچە شاخاویەدا بۆی ناردبوون تا باوەڕ بە سالح پێغەمبەر بێنن و رووبکەنە خواناسین و واز لەو خراپەکاریانەیان بهێنن ) .

( فَقَالَ لَهُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقۡيَٰهَا ) .. پێغەمبەرەکەشیان پێیانی وتبوو کە واز لەو وشترە بێنن و رێی لێنەگرن بۆ کوێ ئەچێ بابچێ و لە کوێ ئاو ئەخواتەوە با بخواتەوە .. وەك تاقیکردنەوەیەك بۆ ئەو میللەتە ئایا تا چ ئاستێ گوێڕایەڵ و پابەند ئەبن بە رێنمایی و فەرمایشتەکانی خوای گەورەوە !!

( فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمۡدَمَ عَلَيۡهِمۡ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمۡ فَسَوَّىٰهَا ) .. بەڵام ئەو کەللەڕەق و نەگبەتانە گوێیان نەدایەو لە خوانەترسان و ورگی وشترەکەیان هەڵدڕی ، بەو پێیە خوایان لە خۆیان ڕەنجاندو کەوتنە بەر لێشاوی توڕەیی و سزای خوای مەزنەوەو سزاو ئەشکەنجەیەکی زۆر سەختی بەسەرا باراندن و ماڵ و خانوو کۆشك و تەلاریانی تێکوپێکدا و لە گەڵ زەویدا تەختی کردن و کردنی بە پەندی زەمانە بۆ ئەوانەی دوای خۆشیان !

( وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا ) .. خۆ خوای بالادەست کە ئەوکارانە ئەنجام ئەداو سزای سەختی خۆی ئەبارێنێت بە سەر هەر کەس و هەر گەل و

نەتەوەیەکـدا لەکـەس ناترسـێ و حـساب بـۆ کـەس ناکـات و زەوی و ئاسمانـەکان هـەر هـەمووی لـەنێوان دوو پەنجـە لـە پەنجـە پیرۆزەکانیدایـەو چۆنی بوێت ئاوا هەڵیان ئەسوڕێنێت ـ سبحانه وتعالی ـ .

* * *

**سورەتی ( الليل )**

**مەککیە .... بیست و یەك ئایەتە**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

( وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ) .. **خوای گەورە سوێند بەو شەوو شەوگارە ئەخوات کە سەرجەم سەرزەوی و بوونەوەران دائەپۆشێ و تاریکیەکی گشتگیر پەخش ئەکات بەسەر گیاندارو بێگیانیشدا و لەیەکتریان ون و بزردەکات .**

( وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ) .. **سوێند بەو رۆژگارە روناکە ئەخوات کە پەردەی تاریکی شەو هەڵئەماڵێ و هەموو کون و کەلەبەرێك رۆشن ئەکاتەوەو شتەکان دووبارە بەدیار ئەکەونەوە .. ئاشکرایە کەئەم دوو ساتە بەرانبەرن لە سیفات و لە کاریگەرییانداو بەرانبەرن لە دەورانی گەردونداو هەروەها لەم سورەتەشدا . کە هەرهەمووی ئەوەمان تێدەگەیەنێت هێزێکی گەورەو بەتوانا لە پشتیانەوە هەیەو زۆر بە ئاسانی هەڵیان ئەسوڕێنێ و چاودێریان ئەکات .**

( وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ) .. **هەروەها سوێند بە دروستبوونی ئەو دوو رەگەزی نێرو مێیە ئەخوات کە لە ناو ئادەمیزادو ( زۆربەی زیندەوەرانی تریشدا دیاردەیەکی بەڵگە نەویستە ) .. کە بریتیە لەیەکگرتنی خانەی تۆوێکی نێرینەو خانەی هێلکەیەکی مێینە کە لەناو منداڵدانی مێیەدا لەنگەر ئەگرێ وپاش ماوەیەك مرۆڤێکی نوێی لێ بەرهەم دێ .. ئیتر هەر خوا خۆی ئەزانێت بۆ ئەم جیاوازیەی دروستکردوە لەنێوان ئەو دوو رەگەزەدا ،**

کەسیش نازانێ کێ بەوەیان ئەڵێ ببە بە مێ و بەوەشیان ئەڵێ ببە بە نێرینە .. خۆ پشکنین و زانینی ئەو هۆکارانەش کە بەرپرسیارە لەم جیاوازیە هیچ لە کێشەکە ناگۆڕێ و داهێنەرو دروستکەریان هەر خوای بالادەستەو هیچ هێزێکی تر نیە توانای بەدیهێنانی هەبێت لەنەبوونەوە بۆ بوون ، یا گیان بکا بەبەر بێ گیانانددا ..!

( إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ) .. هەریەك لە ئێوە بەجۆرێکی جیاوازو بۆ مەبەستێکی تایبەتی هەوڵئەدات .. ئاشکراشە کە هەر مرۆڤێك لەم ژیانەدا تایبەتمەندی خۆی هەیە لە ویست و ئارەزووەکانیداو لەو هیواو ئامانجانەش کە خۆی لە پێناویدا ماندوو دەکات ، وەك بڵێی هەریەکەمان جیهانێکی تایبەت بەخودی خۆمان هەیەو لە یەکێکی دی ناچین ..!

( فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ) .. جا ئیتر ئەوەی گیان و ماڵی خۆی بەخت بکاو ببەخشێ لە پێناوی خواداو بۆ رەزامەندی ئەو هەوڵبدات تا لە تورەبوون و سزای ئەو خۆی بەدووربکاو خۆی بپارێزێت لە رووڕەشی و سەرشۆڕی رۆژی دوایی .

( وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ) .. وە باوەڕی تەواوو پتەوی هەبوو بەو ئاین و دینە بەرزو جوانەی خوای پەروەردگار کە بەو پێغەمبەرەدا بۆی ناردوون .

( فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ) .. ئەوا ئەو کەسانە خوای بەخشندە پاڵپشتیانەو رێنماییان ئەکات بۆ رێگای راست و ، گەیشتن بە ئامانجە پیرۆزەکانیان بۆ ساناوئاسان دەکات .

( وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ) .. بەلام ئەوانەی کە رژدو خۆویست و

خۆپەرستن و نە گیان و نە ماڵیان نابەخشن لە پێناو ڕەزامەندی خوای خۆیاندا و پشتیان کردۆتە ڕاستیەکان .

( وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ) .. وە باوەڕیان نەهێناوە بە ئاین و بەرنامەی بەرزو دروستی خوا و دوای پێغەمبەر نەکەوتوون و بەدرۆیان خستۆتەوە .

( فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ) .. ئەوانە شیاوی ئەوەن کە خوای بالآدەست ژیانیان لێ تاڵکاو بەرەو هەڵدێرو گرفت و ناخۆشی و نەهامەتیان ببا و ڕێنمایان نەکات بۆ سەر ڕێگاو بەرنامەو ئاینەکەی خۆیی و هەنگاوەکانیان لەدنیادا سەختترو گرانتربکات .. گەرچی خۆشیان وادابنێن کە لەسەر ڕێی ڕاستن و ڕەوشت و ڕەفتاریان تەواوە ، ئەی نازانن کە هەرهەنگاوێك بنێن لەو ڕێگایەدا زیاترو زیاتر لە خوایان دووردەخاتەوە و بێ بەشیان ئەکات لە بەخشش و نیعمەتەکانی خۆی ؟

( وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ) .. ئەی نازانن ــ گەر شۆڕبوونەوە بەرەو هەڵدێرو لایاندا لە ڕێگای ڕاستی خواپەرستی و کەوتنە بەر شەپۆلی تووڕەیی و سزای خوای گەورە ـ ئەوکاتە ئەو پارەو ماڵوسامانەی دونیایان ـ کە نەیانئەبەخشی و کردبوویانە پردی ڕزگاری خۆیان ـ فریایان ناکەوێ و بۆ تەنهاساتێکیش سزای خوایان لەسەر هەڵناگرێ و باری گرانی سەرشانیان سووك ناکات .

( إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ) .. خوای پەروەردگار ــ بە بەخشش و چاکەی لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا ــ لەسەرخۆی داناوە کە تۆوی هەستی خواناسین و یەکخواپەرستی لەناو بیروهۆش و فیترەتی هەموو مرۆڤێکدا بروێنێ .. وە

بەردەوام بە ناردنی پێغەمبەران یا پەیامە ئاسمانیەکان وەیاخود ئایەتەکانی خۆی ، وەك بەڵگەو رێ پیشاندەر ئەنێرێت تا کەس ستەمی لێنەکرێ‌و کەس بیانووی نەمێنێ .

( وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ) .. خۆ سەرەتای ژیان لەدنیادا هەر ئێمە پێمان بەخشیوون و گەڕانەوەشتان هەر بۆ لای ئێمەیەو کەس لەدەستمان هەڵنایەو توانای خۆبزرکردن و خۆ شاردنەوەتان نیە لێمان .

( فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ) .. ئەی من ئاگادارم نەکردونەتەوە و نەمترساندوون بە ئاگرێکی سەخت و توندو بڵێسەدارو سوتێنەری ناو دۆزەخ .!

( لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ) .. کە تایبەتە بەوانەی زۆر نەگبەت و کەللە ڕەق و بەدبەخت بوون .. جا ئەبێ بەدبەختی لەوەزیاتر چی بێت کە شەووڕۆژ لەناو ئەو ئاگرە گەورەو سوتێنەرەدا ژیان ببەنەسەر ..!

( الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ) .. ئەو نەگبەت و بێ مێشکەی بانگەوازی پێغەمبەری بەدرۆئەخستەوەو پشتی کردبوە رێنمایی و بەرنامەی خواو لە دنیای بێباکیدا مەست وحەیران بووبوو .

( وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى ) .. بەلاّم ئەوانەی لەخواترساون و ڕەزامەندی خوا مەبەستیان بوە ، ئەوانە هەرگیز سزا نادرێن و بەدوورن لەو ئەشکەنجە سەخت و ناهەموارە .

( الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ ) .. ئەو لەخواترسەی کە ماڵوسامانی لە پێناو خۆپاککردنەوەو دەرون خاوێن کردنەوەو گەیشتن بە ڕەزامەندی خوادا

ئەبەخشێ ، نەك بۆ ناودەركردن و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی كەسانی دی .

( وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٍ تُجۡزَىٰٓ ) .. خۆ ئەم بەندە لەخواترسانە كە ئاوا پارەو ماڵوسامانی خۆیان ئەبەخشن بۆ ئەوە نیە كەچاكەی ئەو خەڵكانەیان بەسەرەوەبێ و بیانەوێ چاكەیان لەگەڵا بكەنەوەو پاداشتیان بدەنەوە ..

( إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ) .. نەخێر بەڵكو تەنها ڕەزامەندی خوای گەورە مەبەستیانەو ئەیانەوێ لێخۆشبوونی ئەو بەدەست بێنن و خەلاتی گەورەی دواڕۆژیان دەستبكەوێت .

( وَلَسَوۡفَ يَرۡضَىٰ ) .. خوای بەخشندە بەم ئایەتە كورتە مژدەیەكی زۆر خۆش و گەورە ئەدات بەو بەندە لەخواترس و دڵودەرون پاكانە بەوەی كە پێیان ئەفەرموێت : بێگومان ڕازی ئەبێت .. بەچی ؟ ڕازی و خۆشبەختە بە بەندایەتی خوا ، بە دین و ئاینەكەی ، بە چارەنووس و بەختی خۆی ، بە خۆشی و ناخۆشیەكانی ژیانی ، بە هەژاری و بەدەوڵەمەندی ، بە تاڵی و شیرینی ، بە هەورازو نشێوەكانی ژیانی .. ئەركی سەرشانی خۆی پێ گران نیەو پەلەناكات لەئەنجامدانیدا .. كە ئەمانە هەمووی خۆی لە خۆیدا پاداشت و خەلاتێكن گەر بە یارمەتی و سۆزی خوای گەورە نەبێت بەدەست ناهێنرێن ، تەنها بەوانەی ئەبەخشێت كە چاویان جگە لەو كەسی تر نابینێ و هەوڵ و كۆششیان هەر بۆ ڕەزامەندی ئەو پەروەردگارە خۆشەویستەیانە ...

* * *

سورەتی ( الضحى )

مەککیە .... یانزە ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( ئەم سورەتە بە بابەت و گوزارشەکان و دیمەن و سێبەرەکانیەوە یەك پارچە سۆزو بەزەیی و دەستهێنانە بەسەر برین و ئێش و ئازارەکانداو دڵنیایی و باوەڕبەخۆبوون ئەچەسپێنێ لە دڵودەروندا .. لە چەند سەرچاوەیەکەوە ئەگێڕنەوە کە سروش و وەحی بۆ ماوەیەك نەهاتبوونە خوارێ بۆ سەر پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ، جوبریلیش ــ سەلامی خوای لێبێت ــ نەهاتبوە خزمەتی ، ئیتر بێباوەڕانی قورەیش کەوتبوونە قسە و قسەلۆك و ئەیانوت : خواکەی مەحەمەد وازی لێهێناوەو بەجێی هێشتوە .. خۆ لەو کاتوساتانەشدا وەحی و دیداری جوبرائیل و پەیوەندیکردن بەخوای تاکوتەنهاوە تاکە توێشووی پێغەمبەرمان بوو لەو ئەرکە سەخت و ڕێگا پڕ ناسۆریەدا .. هەربۆیە خوای گەورەمان ئەم سورەتە نایابەی بۆ ناردە خوارێ‌و کردیە دیاری‌و پێشکەشی خۆیی و نەتەوەکەشی کرد :

( وَٱلضُّحَىٰ ) .. خوای پەروەردگار بەو دووکاتە ناسك وسرووش بەخشە سوێند ئەخوات ، یەکەمیان کاتی بەرزبوونەوەی خۆر لەئاسۆدا .

( وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ) .. ئەوی تریشیان ، کاتی داهاتنی شەوی تاریك و نووتەکە ، کە سەرجەم بوونەوەران بە پەردەیەکی تاریك دادەپۆشی و لەچاو بزریان ئەکات .. بەم سوێند خواردنەشی دیاردە گەردوونیەکان پەیوەست ئەکات بە سۆزو هەست ونەستەکانی دڵودەرونەوە ، ئیتر پێغەمبەرو

سەرجەم ئادەمیزادە خاوێن و پاکەکان دڵودەرونیان ئاشناو هۆگری ئەم بوونەوەرە ئەبێت و خۆیان بەنامۆو بێکەس نازانن لەناویاندا ..

( مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ) .. سوێند بەو دوو ئایەتە گەورانە خوای پەروەردگارت وازی لەتۆ نەهێناوەو پشتی تێنەکردووی .. وەك دوژمنە دڵڕەقەکانت وا ئەڵێن ، ئەو خوای پەروەردگاری تۆیە تۆش بەندەی خۆشەویستی ئەو پەروەردگارەیت ، هیچ کاتێ کانیاوی هەڵقوڵاوی سۆزو بەخششی ئەوت لێنابڕێ و هەردەم سەرپەرشتیارو پارێزەرتە .

( وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ ) .. ئەو نازو نیعمەت و بەخششەی لە ڕۆژی قیامەتدا پێت ئەبەخشێ و بۆی هەڵگرتووی زۆر لەوەی ژیانی ئەم دنیایەت باشترو چاکترو فراوانترە ..

( وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ ) .. هەر ئەو پەروەردگارەتە کە ئەوەندەت پێدەبەخشێ لە سەرفرازی و سەرکەوتن و لادانی کۆسپ و بەربەستەکانی سەرەڕێ و بڵاوبوونەوەی ئاین و بەرنامەکەت ، کە دڵخۆش و ئاسودەو ڕازی ببیت و غەمی ئازاردان و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانت لە دڵا بڕەوێنێتەوەو نائومێد نەبیت لە گەیاندنی ئەرك و پەیامە پیرۆزەکەت .

( أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ) .. ( سەیری بارو دۆخی ژیانی خۆت بۆ ناکەیت تا بزانیت ئایا خوای پەروەردگارت ئاگای لێتە و سەرپەرشتیت ئەکات یان نا؟ ) . ئەی هەر تۆ نەبوویت کە بە هەتیوی و بێ باوکی لەدایکبوویت بەڵام ئێمە جێگاو خانەوادەیەکی بەسۆزو خانەدانمان بۆڕەخساندی و دڵی کەسوکارمان بۆ نەرمکردی .. تەنانەت ئەبوتالیبی مامیشت کە لەسەر دین و

ئاینەکەی تۆش نەبوو ، هەر هەموویمان کردە سەرپەرشتیارت و ئاگادارت بوون..!

( وَوَجَدَكَ ضَآلاً فَهَدَىٰ ) .. هەر تۆ نەبووی کە لە دەوروبەرو ژینگەیەکی نەفام و جاهیلیدا گەورەبوویت ـ کەچەند بیروباوەڕێکی پووچەڵ و دین و ئاینێکی خواروخێچێنراو باوبوو لەناویاندا ، تۆش نەتئەزانی روو لە کوێ بکەیت و دوای چ بیرو باوەڕێك بکەویت ـ بەڵام ئێمە ڕێنماییمان کردی و ڕێگای ڕاستی ئیسلاممان پیشاندایت و کردمانیتە سەرقافڵەی کاروانی ئیمانداران و باوەڕداران .

( وَوَجَدَكَ عَآئِلاً فَأَغْنَىٰ ) .. نەك هەرئەوەش بەڵکو کە بینیمان هەژارو دەستکورت و بێ ماڵوسامانیت ، یەکەمجار دڵودەروونمان دەوڵەمەند کردی و دواتریش ماڵوسامانمان لە ڕێی بازرگانیەوە پێبەخشیت تا لە هەژاری و دەستکورتیی رزگارت ببێ و چاونەبڕیتە ماڵ وسامانی ئەوانەی دەوروپشتت .

( فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ) .. کەواتە دڵی هەتیوو بێ باوکان مەڕەنجێنەو هانی خەڵکی بدە بۆ یارمەتیدانیان و سەرپەرشتیکردنیان تا لە خەم ئەڕەخسێنەوەو پشت بەخۆیان ئەبەستن .

( وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ).. دەست مەنێ بە رووی کەسەوەو ئەوەی ئیشێکی پێت بوو یا داوای یارمەتیەکی لێکردیت بە دەنگیەوە بچۆو نا ئومێدی مەکە .

( وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ) .. بەردەوامیش باسی ئایەت و نازو

نیعمەتـەکانی خـوای پـەروەردگار بـۆ خـەڵکی بکـەو نـاوو یـادی ئـەو بکـە بـە ویردی سەرزمانت و بانگەوازە پیرۆزەکەی خـوا بڵاوبکەرەوە لـەناو کۆمـەڵداو هانیان بدە بۆ یەکخواپەرستی و باوەڕهێنان بـەم دیـن و ئاینـە پـاك و جـوان و بەرزو بڵندە ..

* * *

سورەتی( الشرح )

مەککیە .... هەشت ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ئەم سورەتە تایبەت بوو بۆ دڵنەوایی پێغەمبەرو (ﷺ) دەستی سۆزو میهرەبانیی هێنان بەسەر دڵودەرونی پاکو بێگەردیدا .. بۆیە خوای میهرەبان و پەروەردگار ئەفەرموێت :

( أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ) .. ئەوە ئێمە نەبووین کە دڵی تۆمان کردەوە بۆ وەرگرتنی ئەم بەرنامەو بانگەوازە و ئاسانکاریمان بۆ رەخساندی ولامان ئازیزو خۆشەویست کردی .. رێگاشمان وا بۆ رۆشنکردیتەوە کە بتوانیت کۆتاییە پرشنگدارو شکۆمەندەکەشی بەچاوی خۆت ببینیت !

( وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ) .. ئەوبارەگرانەشمان لەسەر سوککردیت کە لە ژێریدا ئەتنالاندو ماندووی کردبوویت .

( الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ ) .. ئەو راسپاردە گەورەیەیەی خەریك بوو ئەرکی گرانی پشتت بشکێنێت .. وە هەر کە دڵت کرایەوە بۆ هەڵگرتنی ئەرکی پێغەمبەرایەتی و بانگهێشتنی خەڵکی بەرەولای خواو بەرەو ئاینی پاکی ئیسلام ، هەرلەو کاتانەدا باری سەرشانت گرانی نەماو هەستت بە سووکی و سانایی دەکرد لە رەوتی کاروانە پیرۆزەکەتدا ..هەروەها لەگەڵ هاتنی وەحی و سروش لەلایەن فریشتەی پایەبەرزو خۆشەویستی خوا جبریلەوە ــ سەلامی خوای لێبێت ــ دڵودەرونت زیاتر کرایەوەو راستیەکانی ئەم

بانگەوازەشت لا رۆشنتربوەو، بوونە کەرەستەو یاریدەدەر بۆ هەنگاونانی خێراترو شیاوو لەبارتر بەرەو لای خەڵکی و کردنەوەی دەروازە داخراوەکانی دڵودەرونی ئەم مرۆڤایەتیە کەلە دەریای نەفامی و بەدکاریدا نوقم بووبوون ..

( وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ) .. ناوی تۆو باسکردنی تۆمان زۆر بەرزو بڵند کردوە .. لەئاسمانداو لەناو کۆڕی فریشتە پاکەکاندا باستدەکرێ ، لەسەرزەویش هەردەم ناوت دەهێنرێت ، بەڵکو لەناو سەرجەم بوونەوەراندا باستدەکرێ .. ناوی تۆمان وا بەرزکردۆتەوە کە هەر ناوی پیرۆزی خوای پەروەردگار بهێنرێت هاوکات لە گەڵیدا ناوی تۆش ئەهێنرێت : (( لا إله الا الله ، محمد رسول الله )) .. جا ئەبێ چ پلەو پایەیەك بگاتە بەرزی و بڵندی و پیرۆزی ئەم ناو هێنان و یادکردنە ؟! هەروەها لەناو (اللوح المحفوظ ) یشدا ناوی تۆمان بەرزو خۆشەویست کردوەو بەدرێژایی رۆژگارو سەردەمەکان هەر ناوت پیرۆزەو لەگەڵ درودو سەلام و سڵاو لەدیدارت و دەربڕینی ئەوپەڕی ماناکانی خۆشەویستی و رێزلێنان .. جا ئیتر تۆ ئەبێ هەست بە هیچ ناخۆشی و ناڕەحەتیەك بکەیت لەگەڵ ئەم هەموو رێزلێنان و پایە بڵندیو خۆشەویستیەدا ؟!

( فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ).. بێگومان لەگەڵ هەر ناخۆشی و قەیران و تەنگ و چەڵمەیەکیشدا خۆشی و ئاسوودەیی و شادی و فراوانی دەبینرێ و دەرگاکان هەرهەمووی لە یەك کات و لەپڕ داناخرێن و بەزەیی و بەخششی خوا لە مرۆڤ ناشاردرێتەوە .. بۆیە هەر کە بارت گرانبوو ، وە ناخۆشی و تەنگانە رووی تێکردیت ، ئێمە ئاگاداربووین و بارگرانیمان سووك کردی و

فراوانی و ئاسودەیی بوونە دۆست و یاوەرت و شادو دڵخۆشمان کردیت .

( إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرٗا ) .. دووبارەکردنەوەی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەر (ﷺ) بەتەواوی لە ناخۆشی و ئێش وئازاردا بوەو ئەو ئەرکەی سەرشانی زۆر قورس و گرانبوە ، بۆیە خوای باڵادەست تەئکید لەم مانایە دەکاتەوە پێغەمبەرو یارانیشی لێ دڵنیا ئەکاتەوە ..

( فَإِذَا فَرَغۡتَ فَٱنصَبۡ ) .. ئیتر هەر کە کەمێك ئێش وکارو فرمانت لەگەڵ خەڵکیدا کەم بوەوەو خەمی دابینکردنی پێداویستیەکانی ژیانت رەوینەوە ، ئەوکاتە وەرە بەڕاستی رووبکەرە خوای پەروەردگارت .. کە هەر ئەو شایانی ئەوەیە هەموو تواناو هەوڵ و کۆششتی بۆ تەرخان بکەیت و لە پێناو رەزامەندی ئەودا خۆت ماندوو بکەیت ، وەرە بەرەو خواپەرستی و خۆت لەهەموو شتێکی ئەم دنیایە دووربخەرەوەو رووبکەرە بارەگای پاکی خوای تاك وتەنها ..

( وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرۡغَب ) .. تەنها بەرەو لای خوای باڵادەست هەنگاو بنێ و بیر لەو نەبێ لەهیچ شتێکی تر مەکەرەوەو هەرئەوت لەیاد بێت .. چونکە بێگومان ئەم کاروانە سەختەی بۆمان هەڵبژاردوویت پێویستی بە توێشویەکی تێرو تەسەل هەیە لە خۆراکی خواناسین و خواپەرستی ، وە هەر لەم کاروانەدایە کە لەدوای هەموو ناخۆشی و تەنگانەیەك خۆشی و فراوانی ئەبینی و هەر گرتنەبەری ئەم رێگایە رزگارت ئەکاو بەرەو کەنارەکانی سەرفرازی و سەرکەوتنی یەکجارەکیت دەبات ..

* * *

سورەتی ( التين )

مەككيە .... هەشت ئايەتە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ) .. خوای گەورە سوێند ئەخوات بە هەنجیرو بە زەیتون .. زانایـان زۆریـان وتـوە دەربـارەی مەبەسـت لـەم دوو بەرهـەم و خواردنـە .. دەربـارەی ( الـتين ) ئـەڵێن : لەوانەیـە ئاماژەبێـت بـۆ دۆڵـی ( تینـا ) لـە نزیـك شاری دیمەشق ، یا ئـەو دارهـەنجیرە بـێ کـە ئادەم وحـەوا بەگـەڵای دارەکـەی خۆیـان داپۆشـی لەبەهەشـتدا تـا لەشـیان دەرنەکـەوێت . یـا مەبەسـت لـەو چیایەیە کەشـتیەکەی نـوح پێغەمبـەر ــ سـەلامی خـوای لێبێـت ــ لەسـەری لەنگـەری گـرت کـە دارهـەنجیری لێ روابـوو .. دەربـارەی زەیتـونیش ئـەڵێن : ئاماژەیە بۆ چیای زەیتا لە شاری قودس ، یا هەر بـۆ خـودی شـاری قـودس . یاخود مەبەسـت لـەو چڵە دار زەیتونەیـە کەکۆترەکە هێنایـەوە لەگـەڵ خـۆی کاتێ نوح ناردی بزانێ لافاوەکە بەکوێ گەیشتوە جا کە گەڕایـەوەو ئـەو چڵە زەیتونەی بەدەنوکەوەبوو زانی وشکانی دەرکەوتوەو روەك و سەوزایی لێیە . هەروەها ئەڵێن کە ئەم هەنجیرو زەیتونە هێما نین بۆ شتی تـر بەڵکو هـەر ئـەو دوو بەرهەمەن کە ساڵەهای ساڵە مرۆڤـ ئەیانخواو سودیان لێوەرئەگرێت .

( بــەڵام لەوانەیــە نــزیکترین مەبەســت لــە ناوهێنــانی ئــەم دوو بەرهەمــە ئامـاژەکردن بێـت بـۆ ئـەو شـوێن وجێگایانـەی کـە پەیوەنـدیان بـە رەوت و مێـژووی ئاین و بیروبـاوەڕەوە هـەبێت ( کـە ناوچـەی سینـای ئێسـتایە ) . یـا پەیوەندی بە سەرەتای دروستبوون و ژیانی ئادەمیزادەوە هـەبێت ئەوکاتـەی

کە هێشتا هەر لە بەهەشتا بوو .

( وَطُورِ سِينِينَ ) .. سوێند بە کێوی ( طور) .. کە لەوێوە موسا پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لێبێت ـ بانگهێشت کرا بۆ دیداری خوای پەروەردگار .

( وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ) .. سوێند بەم شارە ئارام وهێمنە .. کە کەعبەی پیرۆزی ماڵی خوای مەزنمانە .

( لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ) .. سوێند بەو شتە پیرۆزانە کە هەرلەسەرەتاوە ئەم مرۆڤەمان لە باشترین وجوانترین و ڕێکترین شێوەدا دروستکردوە .. ئەم سوێند خواردنەی خوای گەورە بەڵگەیە بۆ ڕێزلێنانی تایبەتیی لەم بوونەوەرە ، ئەوەش دەسەلمێنێ کە ئەرکی سەرشانیشی ئەبێ لە ئاستی ئەو شێوازە ڕێك وجوانە بێت لە دروستکردنیدا .

( ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ) .. پاشان ( کاتێ ئەم مرۆڤە نازدارو ڕێك وپێکە لائەدات لەو ڕێساو بەرنامەیەی کە خوای پەروەردگاری بۆی نەخشەکێشاوەو دوای ئەوەی ویست و توانای ئەوەی داوەتێ کام شێوازی ژیان بۆخۆی هەڵبژێرێت ، ئەو ئەچێت پشت ئەکاتە بەرنامەی خواناسان و خۆی فڕێ ئەداتە ئامێزی ئارەزوە نزمەکانیەوەو بە بەرنامەو پەیڕەوە لاوازو کاڵوکرچەکانی مرۆڤکردەوە هەڵئەخەڵەتێ و ویست وئیرادەی لێ زەوت ئەکرێ و لە دەلاقەی تێگەیشتنی ئەوانەوە بۆ ژیان و بوون و گەردوون ئەڕوانێت ) .. ئا لەم کات وساتانەدایە کە ئەو مرۆڤە پلەو بەهای بەرزی مرۆڤایەتی خۆی لەدەست ئەداو ئەخزێ بەرەو ئاستێکی نزم و کەم نرخ .. کە تەنانەت ئاژەڵانی بێ هزرو بێ زمانیش لەو بڵندتر دەبن چونکە ئەوان

لەئاستی خۆیان کەم نەکردۆتەوەو شێوازی ژیانی دیاریکراوی خۆیان بەرەو نزمتر نەگۆڕیوەتەوە .

( إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ) .. بەڵام ئەوانەی بەتوندی دەستیان بە بەرنامەو ئاینی خوای گەورەوە گرتوەو ئیمان و باوەڕیان پتەوو چەسپاوە و کردەوەیان جوانە و ڕەوشتیان بەرزەو خێرخوازو مرۆڤ دۆستن ، ئەوانە پاداشت و خەڵاتی بەرزو بەنرخی هەمیشەیی لە خوای باڵادەست و پەروەردگاریانەوە وەرئەگرن و سەرفرازیی و بەختەوەریی ڕۆژیی قیامەتیش بەدەست دێنن .

( فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعۡدُ بِٱلدِّينِ ) ..جا ئیتر ئەی مرۆڤ، دوای زانینی ئەم ڕاستیانە چۆن ئەتوانیت ئاین و بەرنامەی خواناسین بەدرۆ بخەیتەوەو ڕوونەکەیتە ئەو ڕۆشناییەو لەتاریکی ژیانی خوانەناسیدا بەنەفامی بمێنیتەوە ؟ .

( أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ ) .. ئەی نابینی خوای پەروەردگای بەخشندە چەند دادوەرو بەسۆزو بەزەییە لەگەڵ بەندەکانی خۆیداو چەند بەجوانی پاداشتی باوەڕداران ئەداتەوەو سزای سەختیش ئەکات بەبەر بێ باوەڕە بەدکارەکانیشدا ..

هەرلەڕوانگەی ئەم ئایەتەوە ، لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : هەرکامتان ئەم سورەتەی خوێند کە ئەفەرموێ : ( والتين والزيتون )و گەیشتە کۆتایی و وتی : ( أليس الله بأحكم الحاكمين ؟ ) .. با ئەویش بڵێت : بلى وأنا على ذلك من الشاهدين .. یانی ( بەڵێ وایە منیش شایەدی ئەوە ئەدەم و لام ڕوون و ئاشکرایە ) ...

سورەتی ( العلق )

مەککیە .... نۆزدە ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ) .. ( ئەم چەند ئایەتەی سەرەتای ئەم سورەتە یەکەمین ئایەتی قورئانی پیرۆزبوون کە هاتنە خوارێ بۆ سەر پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویستمان (ﷺ) .. بەناوی خوای پەروەردگارەوە دەست پێئەکات و هەر لە یەکەمین ساتی پەیوەندی کردنی بە فریشتە پاك و پایە بەرزەکانەوەو یەکەمین هەنگاوی لە ڕێگای بانگەوازدا بۆ خواپەرستی پێغەمبەر ئاڕاستە ئەکات بۆ ئەوەی ) : ( اقرأ باسم ربك ) .. بە ناوی پاکوبەرزی خوای گەورەتەوە بخوێنە .. ( الذي خلق ) .. ئەو خوایەی لە نەبوونەوە بوونەوەرانی بەدیهێناوەو دروستیکردون ..

( خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ) .. ئەو خوایەی ئادەمیزادی لە پارچە گۆشتێکی هەڵواسراوی بێ جوڵەی ناو مناڵداندا دروستکردوە .. لەو سەرەتا بچوك و سادەیەوە دروستیکردوون .. ئیتر ئەوە چ تواناو چ بەخششێکە کە ئەو پارچە گۆشتە سادەو بچووکە ئەگۆڕێت بۆ ئەم مرۆڤە گەورەو بەتوانایە کە توانای فێربوون و فێرکردنیشی هەیە !!

( ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ) .. خوای بالادەست فەرمان بە پێغەمبەر ئەکات کە بەناوی خوای تاکوتەنهاو فرەبەخشندەوە بخوێنێت .

( ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ) ..ئەو خوایەی بە پێنوس و بە قەڵەم ئەم ئادەمیزادەی

فێرکـــردوەو فێرئـــەکات .. چـــونکە قەڵـــەم لـــەوەو پـــێش و لەمـــەودواش بەچـــاکترین و باشـــترین ئامرازەکـــانی فێرکـــردن دادەنرێـــت لـــە ژیـــانی مرۆڤایەتیدا..

( عَلَّمَ ٱلۡإِنسَـٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ) .. ئـەو شـتانەی فێـری ئـادەمیزاد کـردوە کـە نـــەیزانیون .. سەرچـــاوەی فێربـــوون و هـــەموو زانیاریـــەکان هـــەرخوای پـەروەردگار خۆیـەتی ، وە ئـادەمیزاد ئەوشـتانەی کـە ئـەیزانێت هەرلـەوەوە فێربـوە .. نهێنیـەکانی ژیـان و زانیاریـەکان دەربـارەی بوونـەوەران هـەرخوای بالأدەست خۆی فێری کردووین و تێی گەیاندووین .

( كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَـٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ) .. بـەلأم نـەخێر ـــ بەشـێوەیەکی گـشتیی مرۆڤـی نـەفام سـەرەڕای ئـەوەی خـوای بالأدەسـت بـەدیهێناوەو فێریکـردوەو ڕێـزی لێناوەو ئەو هەموو نازو نیعمەتەی بەسەرا ڕژاندوە ـــ هێشتا خۆی بە گـەورە دائـــەنێ و هەســـت بـــەو هـــەموو بەخشـــشە ناکـــاو سوپاســـبژێری خـــوای پەروەردگاری نیەو بەرەو بەدکاری و ملهوڕی هەنگاو ئەنێ ! ..

( أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ) .. کـــاتێ ســـەیر ئـــەکات وا بەوشـــێوە جـــوان و ڕێکـــە دروستکراوەو ئـەو هـەموو نیعمەتـەی بەسـەرا ڕژانـدوە ، وا تێئـەگات کـە ئـەو هـەرخۆی شـایانی ئەوشـتانەیەو چـاکەی خـوای بەسـەرەوە نیـەو ئیـشەکە هەرئەبێ وابێ ، بۆیە پشت ئەکاتە خواو بەرنامـەی خـواو بانگـەوازی پـیرۆزی پێغەمبەری خواو (ﷺ) منەتی بە هیچ شتێك نامێنێ و لوتبەرز ئەبێ و خۆی بە شت ئەزانێت ..!!

( إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ) .. باشـــە ئەوکەســـەی وا بـــێ منەتـــەو سوپاســـی

خواناکات و دوای پێغەمبەرەکەی ناکەوێت ، روو لەکوێ ئەکاو پەنا بۆ کێ ئەبات ؟ لە کاتێکدا کە هەموو شتێك هەر بۆ لای خوای تاکو تەنها ئەگەڕێتەوەو لەسەر هەموو شتێك پرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکات و لێشیان بێ ئاگا نیە .. ( وە لێرەوە یەکێك لە بنەماکانی بۆچوونی ئیسلامی سەرهەڵئەدات . ئەویش گەڕانەوەمانە بۆلای خوای گەورە لە هەموو کات و ساتێك و لەهەموو کارو کردەوەیەکدا .. باش وخراپ ، هەژارو دەوڵەمەند ، خێرخوازو شەڕخواز ، خواناس وخوانەناس ، هەر هەموومان ئەچینەوە بەردەستی خۆی و کەس خۆی پێ ناشاردرێتەوەو خۆی پێ قوتارناکرێ ) ..

( أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ) .. لێرەدا دێتە سەر باسی یەکێك لەو نەفامە ملهوڕانەی ئازاری پێغەمبەرو موسوڵمانانیان ئەدا لە شاری مەکە لە سەرەتای بانگەوازی ئیسلامدا . کە ئەویش ( ئەبو جەهل )ی مامی دڵڕەق و کەللە رەقی پێغەمبەری خۆشەویستمانە (ﷺ) ، ئەفەرموێ : ئەوکابرایەت نەبینی چۆن هەڵئەشاخا بە روویدا .. ئەو کردەوە ناشرین و بەدڕەفتاریەت نەبینی ؟.

( عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ) .. بە رووی ئەو بەندە موسوڵمانەی خەریکی نوێژکردنی خۆی بوو کە مەبەستی پێغەمبەرە (ﷺ) ..سەیر لەوەدایە ئەو کەسەی بەرویدا هەڵئەشاخێ و لێی تورەئەبێت پیاوێکی بەندەی خواناس و دیدەڕۆشن و نوێژخوێنە .

( أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ) .. هەروەها رێنماو لەخواترسەو سوودو قازانج نەبێت زیان و زەرەری بۆکەس نیە .

(أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ) .. خەڵکیی بانگهێشت ئەکات بۆ لەخواترسان و خۆپاککردنەوە لە بەدکاری و وازهێنان لە بەدڕەفتاری و دوورکەوتنەوە لە ستەم و زۆرداری ..

( أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ) .. بەڵام ئەوەی ئازاری ئەداو ڕێی چاکەو چاکەخوازی لێئەگرێت کابرایەکی ستەمکارو درۆزنە و پشتی کردۆتە بانگەوازی خواو منەتی بەکەس نیە .

( أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ) .. ئەی نازانێت کە خوای باڵادەستی بە هێزو بەتوانا ئاگای لە هەموو شتێکەو چاوی پیرۆزی هەموو شتێك ئەبینێ و ئەو کردەوە نەگریس و ناشرینەی ئەویش ئەبینێ و زۆریش پێی تووڕەبوە ..!

( كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ) .. بە تووڕەییەوە ئەفەرموێت : نەخێر، گەر وازنەهێنێ و پاشگەز نەبێتەوە لەو کردەوە ناشرینانەی ، ئەوا زۆر بەتوندی کاکۆڵ و ناوچەوانی ئەگرین و ڕایئەکێشین و فڕێی ئەدەینە ناو ئاگری سوتێنەری دۆزەخەوە .

( نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ ) .. ئەو ناوچەوانەی کە هێمای لوت بەرزی وسینگ دەرپەڕاندنی ملهوڕیی و درۆزنیی و گوناهباریی ئەو بەدڕەفتارانەیە .

( فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ ) .. ئینجا ئەو لەو جێگا سەخت و مەترسیدارەدا کێ بە پیاو ئەزانێت لە خزم وکەسوکارو دۆست وبرادەرەکانی با بانگیانکات گەر ئەزانێت بە فریای ئەکەون و ئەیپارێزن و پشتی ئەگرن ..!

( سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ) .. ئێمەش چەندین فریشتەی مەچەك ئەستوورو

زەبەلاح و تووڕەو سامداری بۆ بانگ ئەکەین .. کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم کابرا گێل و نەفامە هەر بەمێشکیشیدا نەهاتوە کە خوای بالآدەست فریشتەی وا تووڕەو جەستە گەورەو بێ بەزەیی و سزادەری ئامادەکردبێت بۆ سەرپێشۆڕکردن و سزادانی ئەوو نموونەکانی ئەو لە هەر سەردەم و رۆژگاریکدا بووبن !

( كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ) .. نەخێر .. هەرگیز لەو کابرایە نزیك مەبەوەو بەگوێی مەکەو خەریکی خواپەرستی و سوژدەبردن و دوعاکردنی خۆت بەو هەر لەهەوڵی لەخوانزیکبوونەوەدا بەو هەموو کات خوات لەبیربێ و یادی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارت بکەرەوە ..

* * *

سورەتی ( القدر )

مەککیە .... پێنج ئایەتە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ئەم سورەتە باس لەو شەوە پیرۆزە ئەکات کە خوای گەورە خۆی دیاری کردبوو ، وە سەرجەم بوونەوەرانیش ئاگاداری ئەو رووداوە مەزنە بوون و سەراپا خۆشی و ئاسوودەیی و دڵفراوانی باڵی کێشابوو بەسەریاندا .. ئەو شەوەی پەیوەندی رەهاو ئاشکرا لە نێوان زەوی و فریشتە پایە بەرزەکانی ئاسمانانیشندا هاتەدی .. شەوی دەسپێکردنی هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆز بۆ سەر موحەمەدی خۆشەویست و پایە بەرز(ﷺ) .. ئەوشەوەی گەورەترین رووداوی بەخۆیەوە بینی کە پێشتر سەرزەوی وەها رووداوێکی نەبینی بوو لە مەزنی و پیرۆزی و پڕمانایی و پڕکاریگەری بۆسەرژیانی سەرجەم مرۆڤایەتی .

( إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ) .. ئێمە لە شەوی ( القدر ) دا ناردمانە خوارێ . کە لەوانەیە مانای دیاریکردن و رێکخستن بێت یاخود بەمانای بەهاو نرخ و پلەو پایە بێت .. کە هەردووکیشیان لەگەڵ ئەو رووداوە گەردوونیە گەورەیەدا دەگونجێن . رووداوی قورئان و وەحی و پەیام .

( وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ).. خۆ تۆش نازانیت شەوی ( القدر ) چیەو چ پیرۆزیەکی هەیە ؟ .. کە پیرۆزی خۆی لە هاتنەخوارەوەی قورئانەوە وەرگرتوە ، تا ئەو روناکیە پیرۆزەی خۆی بەسەرهەموو بوونەوەراندا پەخش بکاو ئاشتی وهێمنی ـ کە لەگیانی پاکی خوای مەزنەوە سەرچاوەی گرتوەـ

بڕژێنێتە سەر ویژدانی ئادەمیزادو ژیانی مرۆڤایەتیشی پێ ئاوبدات .. هەروەها پیرۆزیی خۆی لەوەوە وەرگرتوە کە ئەم قورئانە سەرچاوەی عەقیدەو بیرو باوەڕو بۆچوون و یاساو شەریعەتە و ڕەوشتێکی ئەوتۆیە کە ئاشتی و ئارامی لەسەرزەوی و لەناو دڵودەرونەکانیشدا بەسانایی بڵاودەکاتەوە .. دیسانەوە پیرۆزیی ئەو شەوە لەوەدایە کە جبریل بەتایبەتی و سەرجەم فریشتەکانی دی ـــ سەلامی خوایان لێبێت ـــ بە فەرمانی خوا ئەم قورئانەیان هێناوەتە خوارێ و لە نێوان زەوی و ئاسماندا لەم کەرنەڤاڵە گەردوونیەدا بڵاوبوونەتەوە ، کەهەر ئایەتەکانی ئەم سورەتە خۆی ئەتوانێت بەو شێوازە جوان و سەرنج ڕاکێشە وەسفیان بکات و نمایشیان بکات

( لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ) .. ئەم شەوی ( القدر )ە لە هەزار شەو چاکترو بە فەرتریشە .. بەڵکو لەهەزاران شەو چاکترو باشترە ، ئەی نابینین کە هەزارەها مانگ و هەزارەها ساڵان و ڕۆژگاران تێپەڕیوون بێ ئەوەی ئەوەندە کاریگەری بەجێ بهێڵن کە ئەم شەوە پیرۆزو پڕبەختەوەری و بێ وێنەیە بەجێی هێشتوە . ئێمەی موسوڵمانانیش ئاڕاستەکراوین بۆ ئەوەی ئەم شەوە لەبیرنەکەین و هەردەم یادی بکەینەوە ، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕێگەی ئەم یادکردنەوەیەی بۆ ئاسانکردووین کە پێمان ئەفەرموێت شەوانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بە خواپەرستی و یادی خوای مەزن ببەینە سەر بەتایبەتی دەشەوی کۆتای ئەومانگە . کە ئەفەرموێت : بۆشەوی ( القدر ) بگەڕێن لە دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا .. هەروەها ئەفەرموێت : هەرکەسێك شەوی ( القدر) بە خواپەرستی و ڕوولەخوابوونەوە بەسەربەرێت و چاوی لە

بەخشین و پاداشتی خوای بالآدەست بێت ، ئەوا ئەو گوناهانەی کردویێتی ئەسرێنەوەو لێبوردنی خوای گەورە بەدەست دێنێت

( تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٍ ) .. هەرلەو شەوەدا جبریل و فریشتەکان هاتوونەتە خوارێ و ئاسمانەکانیان تەنیوەو بە باڵە پانوبەرینەکانیان ئەم قورئانە پیرۆزەیان هەڵگرتوەو هێناویانە بۆ پێغەمبەری سەروەری مرۆڤایەتی موحەمەدی خۆشەویست و پایەبڵند (ﷺ) .. ئەو قورئانەی کە هەموو کاروکێشە ماقوڵ و شیاوەکانی تیاجیاکراوەتەوەو دیاریکراوە ، هەموو بەهاو دیاردە بەنرخەکانی ژیانی تیا شیکراوەتەوەو پێوەرەکانی کاروکردەوەکانی مرۆڤی تیا دەستنیشانکراوەو ئامانج و مەبەستی بوون و ژیانی سەرجەم تاك و گەلان و نەتەوەو ولآتەکانی تیا بڕیاردراوەو هیچ گومانێکی نەهێشتۆتەوە لەو بوارەدا

( سَلَـٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ) .. لەوشەوەدا ئارامی و هێمنی و ئاشتیخوازی زۆر بەفراوانی بەرپا ئەبێ و باڵی خۆی پەخش ئەکات بەسەر هەموو بوونەوەرانداو لەگەڵ نورو روناکی بەرەبەیان و وەحی و فریشتەکاندا تێهەڵکێش ئەبن .. ئەمانە سەرجەم کات و ساتێکی پیرۆزو بێ وێنە ئەنوێنن کە ناشێ مرۆڤی خواویست و موسوڵمان لێیان بێ ئاگابێ و ئەو شەوە بەئیمان نوێکردنەوەو دوعاو پاڕانەوە نەباتەسەر لەگەڵیاندا . کە ئەم دیاردەیە خۆی یەکێکە لە بنەما سەرەکیەکانی بۆچوون و بەرنامەی ئیسلامیی بۆ پێگەیاندن و پەروەردەکردنی تاك وکۆمەڵ ، تا لە رەوشت و ئاکاری رۆژانەیاندا رەنگبداتەوەو ببنە مۆرك و تایبەتمەندیی مرۆڤی خواپەرست و موسوڵمانان بەگشتی ...

سورەتی ( البینة )

مەدەنیە .... هەشت ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ) .. ئەوانەی تووشی بێ باوەڕی و خوانەناسین بووبوون لە خاوەن پەڕتووکە ئاسمانیەکان و هاوبەش پەیداکەرانیش ، وازیان لەو گومڕایی و بێ باوەڕیەیان نەدەهێنا تا بەرنامەو ئاینێکی نوێیان بۆنەهاتبایەتە خوارێ.. بێ باوەڕی و گەندەڵی رویکردبوە سەرجەم بیرو باوەڕو بۆچوونەکانی ئەوسەردەمە بەتایبەتی خەڵکانی دانیشتووی دورگەی عەرەبی ، وە ئاشکرابوو کە رزگاربوونیان مەحاڵ بوو لەو گۆماوو گومڕاییە مەگەر بە ناردنی بەرنامەیەکی نوێ کە سەرلەنوێ راستیەکانی ژیان و بوون و مردنیان بۆ روون بکاتەوەو مەبەستی راستەقینەی دروستبوونیان و رۆڵی مرۆڤایەتی لەم سەرزەویەدا بۆ جارێکی تر لە دڵودەرون و مێشك و ویژدانیاندا تۆمارو نوێ بکاتەوە

( رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ) .. ئاگادارکردنەوەیان لە رێی پێغەمبەرێکی خوای مەزن کە رێنماییان بکات و لەو زەلکاوە دەریان بهێنێ لەسەر رۆشنایی ئەو یاساو بەرنامانەی لە دووتوێی چەند لاپەڕەیەکی پیرۆزوخاوێندا نوسراوو پارێزراون و خوای گەورەو پەروەردگار بەدیاری بۆی ناردوەو ئەرکی گەیاندن وجێبەجێکردنی ئەو کارە پیرۆزو مەزنەشی بەو

پێغەمبەرە لێهاتوو بەتوانایە سپاردوە ....

( فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ) .. ئەو چەند لاپەڕە پاك و بەنرخ و پیرۆزەش كە قورئانی پیرۆزە ، چەندین بابەت و كێشەی بەرزو بەنرخی تێدایە .. كە چەندەها گیرو گرفت لە ژیانی مرۆڤایەتی چارەسەردەكاو ڕێنمایكەریانە بەرەو لێوارەكانی سەرفرازی و ئاسودەیی .

( وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ) .. خۆ ئەو نەتەوانەی پەڕتوكیان لە ئاسمانەوە بۆ نێردرابوو وە خاوەنی ئاینی تایبەتی خۆشیان بوون دووبەرەكی و ناتەباییەكی گەورە كەوتبوە نێوانیانەوە ، دوای ئەوەش كە بەرنامەیەكی نوێیان بۆ نێردراو هەواو ئارەزووپەرستی دەروازەكانی دڵودەرونیانی داخستبوو ، چاوەكانیشیان هەق و ڕاستی نەئەبینی و دەمارگیری كردبوون .. لێرەدا بە تایبەتی مەبەست لە جولەكەو دیانەكانە كە ناتەبایی و دووبەرەكی زۆر بەقوڵی مێخی داكوتابوو لە نێوانیانداو دوژمنایەتیەكی توند لە نێوانیاندا بەرپابووبوو ..

( وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ) .. كە لە بناغەدا هەر هەموویان فەرمانیان پێكرابوو تەنها خوای باڵادەست بپەرستن و هەر دڵسۆزی ئەوبن و بەرنامەوئاینەكەی ئەو پەیڕەو بكەن و نوێژ لەكاتی دیاریكراوی خۆیدا بكەن و لە ڕێی زەكات دانیشەوە دەسگیرۆیی هەژاران و دەستكورتان بكەن ، كە ئەو بنەمایانە كرۆكی ڕاستەقینەی ئاینی پتەوو دامەزراوی خوای پەروەردگارن ..

( إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ) .. ئەو خەڵکە بێ باوەڕەی سەر بە خاوەن پەڕتووکە ئاسمانیەکان بوون لە گەڵ ئەوانەش کە هاوبەش پەیداکەربوون هەر هەموویان تووشی سزای سەختی ئاگری جەهەننەم ئەبنەوەو بۆ هەتا هەتایە بە نەمری تیایدا ئەناڵێنن و رزگاربوونیان بۆ نیە ، چونکە ئەوانە خراپترین و سەرسەختترین تەرزەکانی ئادەمیزادن .. کەواتە سەنگی مەحەك هەر ئیمان و باوەڕە ، هەرکەسێ خۆی لێ بێ بەشکات ئەوە چارەنوسی ئەبێ و شەرمەزاری هەردوودنیاو قیامەتیش ئەبێتەوە .

( إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ )..لەبەرامبەردا، ئەوکەسانەش کە بە باوەڕێکی پتەوو ئیمانێکی چەسپاوەوە ژیان ئەبەنەسەرو ئەو ئیمان و باوەڕەش هانیان ئەدات بۆ چاکەکردن و سەرزەوی ئاوەدانکردنەوە و دەستگرتن بە بەرنامەی خواوە بۆ ڕێکخستنی کاروباری ژیانیان ، ئەوانە چاکترین و سەرفرازترین جۆرەکانی ئادەمیزادن و هەر ئەوان بەختەوەرو براوەی هەردوو دنیاو رۆژی دواییشن .

( جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُۥ ) ..

جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ..

پاداشتی ئەو دەستەیە لە مرۆڤ لای خوای پەروەردگاریانەو بە بەهەشتی پان و بەرینی خۆی شادیان ئەکات کە پڕە لە باخوباخاتی رازاوەی فراوان و

له ژێریاندا جۆرەها روباری سازگارو بێ وێنه خورەی دێ و چاوو گوێ و دڵودەروونیان پێی ئەحەوێتەوەو هیچ شتێکی وا نابینن یا نابیستن که ئەو خۆشی و نازونیعمەتەیان لێ تێکبداو بە نەمری و بۆ هەتاهەتایە تیا ئەمێننەوەو تاموچێژی ژیانێکی بەردەوام و نەبڕاوه نۆش ئەکەن ..

رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ .. بێگومان ئەو پاداشت و خەڵاتە نایاب و بێ وێنانە لە ئەنجامی ئەوەیە کە خوای بالادەستی میهرەبان لێیان رازیەو دڵخۆشە بە بینینی ئەو بەندە لەخواترس و دڵسۆزانەی خۆی . هەروەها ئەوانیش له خوای خۆیان رازین و ئاسوودەن بەو بەخشش و خەڵاتە گەورەو جوانانەو دڵودەرون و هەستونەستیان لەو پەڕی خۆشی و کامەرانی و شادمانیدایه .

ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ .. ئەو دەسکەوتە گەورانەش ناکرێنە خەڵات و پاداشت تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە زۆر لەخوای خۆیان ئەترسن و سەرپێچی فرمانەکانی ناکەن و ناودڵیان جێگەی هیچ ئازیزو خۆشەویستێکی تری تیانابێتەوە جگە لە خوای گەورە نەبێت و هەر ئەو بۆتە هیواو ئاوات و مەبەست لە ژیانیاندا ..

*          *          *

سورەتی ( الزلزلة )

مەدەنیە .... هەشت ئایەتە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ) .. ئەو کاتەی ئەم زەمینە گەورەیە زۆر بە توندی دەهەژێ و دەلەرزێ .. کە ئەمەش هێمایەکە بۆ یەکێك لە رووداوە ترسناکەکانی رۆژی دوایی .

( وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا ) .. پاشان هەرچی لە ناو ناخیدایە لە لاشەی مردوان و کانزاو سەرجەم پێکهاتەکانی تریشی فڕێ ئەداتە دەرێ و باری گرانی خۆی سووك دەکات

( وَقَالَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا لَهَا ) .. ( لەو کاتوساتە پڕ مەترسی و سامناکەدا سەرجەم ئادەمیزاد بەوپەڕی سەرسوڕمان و ترس و لەرزەوە لە بەرخۆیانەوە) ئەپرسن و ئەڵێن : ئەوە ئەم زەمینە بۆ وا ئەلەرزێ ؟ ئەبێ چ رووداوێك روویدابێ و چی بەسەرهاتبێ ؟

( يَوۡمَئِذٖ تُحَدِّثُ أَخۡبَارَهَا ) .. هەر لەو سات و رۆژگارەدایە کە زەمینی لەرزیو هەرچی بەسەرهاتوەو دیویێتی هەمووی باس ئەکاو بە دەنگی بەرز بۆیان ئەگێڕێتەوە .

( بِأَنَّ رَبَّكَ أَوۡحَىٰ لَهَا ) .. پێیان ئەڵێت کە ئەو بەو لەرزین و فڕێدانە دەرێی لاشەو پێکهاتەکانی ناو هەناوی ، فەرمانی خوای بالادەستی

بەجێهێناوەو ئەو ویستی وابوە ، ئیتر ئەم لەخۆیەوە بەم کارە هەڵنەساوە .

( يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَـٰلَهُمْ ) .. هەر لەهەمان ئەو سات و ڕۆژگارەشدایە کە سەرجەم نەوەکانی ئادەمیزاد بەدرێژایی تەمەنی لە هەموو کون و کەلەبەرو سوچ و لایەکەوە دەستە دەستە بە سەرسوڕمانەوە سەرهەڵئەدەن و دەرئەپەڕنە دەرێ تا تۆماری کاروکردەوەکانیان پیشان بدرێ و ئامادە بکرێن بۆ دادگایی و لێپرسینەوە .

( فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ) .. جا ئیتر هەرکەسێ بابچوکترین و ساناترین کاری چاکەو سودبەخشیشی کردبێت و سودی بە خۆی یا بە خەڵکی تریش گەیاندبێت ئەوا لەم ڕۆژەدا پاداشتی ئەدرێتەوەو بۆی هەڵگیراوەو هیچی لێ کەم نەکراوەتەوەو بە زیادەوە خەڵات دەکرێت .

( وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ) .. بە پێچەوانەشەوە هەرکەسێ کردەوەیەکی خراپ و زیانبەخشی بە خۆی یا بە خەڵکی تر گەیاندبێت و بووبێتە مایەی بڵاوبوونەوەی کردەوەیەکی قێزەون و دژ بە سروشتی ڕەسەنی مرۆڤایەتی ، ئەوا لەم ڕۆژەدا بە سزای سەختی خۆی دەگاو تۆڵەی ئەو سنووربەزاندن و شەڕەنگێزیەی سەردنیای زۆر بەتوندی لێدەکرێتەوە .

* * *

سورەتی (العاديات )

مەككيە .... یانزە ئایەتە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ضَبۡحٗا ) .. خوای گەورە سوێند بەئەسپەكانی ناو گۆڕەپانی جەنگ دەخوات و باسی هەریەك لە رەوت و جوڵەیان ئەكات هەرلەسەرەتای هاتنەناو گۆڕەپان و تا غاردان و حیلەو پڕمەی كاتی غاردانیشیان .

( فَٱلۡمُورِيَٰتِ قَدۡحٗا ) .. ئەوانەی لەلێدانی ناڵیان بە سەر بەردەكانی گۆڕەپاندا پریشكی ئاگر بەرزدەبێتەوەو سامناكیەك پەخش دەكات .

( فَٱلۡمُغِيرَٰتِ صُبۡحٗا ) .. ئەوانەی لەناكاوو لەبەرەبەیاندا شاڵاو ئەبەنە سەر دوژمنان و ترس و لەرز ئەخەنە دڵیانەوە .

( فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا ) .. كە لە ئەنجامدا ئەوناوە ئەبێتە تەپوتۆزێكی وا چاوچاو نابینیێ و تۆز ئەنیشێتە سەر رووی ئەسپ و ئەسپ سوارەكانیش .

( فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا ) .. هەرئەوانن خۆ ئەكەن بەناو دوژمناندا و لەناوەندی ریزەكانیان ئەدەن و سەریان لێ ئەشێوێنن و شپرزەیان ئەكەن .

( إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ) .. ئادەمیزاد هەر لەسروشتی خۆیدا وایە كە سپڵەو بێ وەفایە بەرامبەر خوای پەروەردگاری .. ئەو هەموو نازو نیعمەتەی لەبەرچاو نیە كە بۆی هەڵڕشتوەو نزیكەدەستی كردوەو بەئارەزوی خۆی

سوودو قازانجیان لێوەردەگرێت !

( وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ) .. هەرخۆی و جەستەو ئەندام و کاروکردەوەکانی خۆی ئەبنە شایەدو گەواهیدەر لەسەر ئەو سپڵەیی و ناپاکیەی لە رۆژی لێپرسینەوەو دادوەریداو ناتوانێ دان نەنێت بەو تاوان و رەوشتە نەگریس و قیزەونەیدا ..!

( وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ) .. ئەو کەسانە خۆپەرستن و خودی خۆیان زۆرخۆشدەوێ و ، خێرو چاکەشیان ئەوێ گەر بۆ خۆیان بێ ، چ ماڵ و پارەو سامان بێت یاخود پلەوپایەو دەسکەوتەکانی دی بێت .. بەلاًم هەر بۆ خۆیان ئەوێ و نایانەوێ خەڵکی تر سوودمەندبن لەو بەهرەو دەسکەوتانە .. ئەبینین کە مرۆڤ بەبێ ئیمان و بیرو باوەڕێکی پتەو چەند بچووك و کەم و نزمە ، وە تا پەیوەندی خۆی بەهێز نەکات لەگەڵ جیهانێکی گەورەتر لە جیهانی تەسکی دنیاویستی، هەروا ئەمێنێتەوەو لە زیندانی خۆویستیدا تەمەن بەسەردەبات ، بەلاًم کە هەنگاوی نا بەرەو دنیای خواویستی و چاوبڕینە ژیانی نەبڕاوەی بەهەشتی پان و بەرین ئەو کاتە لەکۆت و زنجیری خۆپەرستی و سپڵەیی رزگاری ئەبێ و دەروازەی ژیانێکی بەرفراوان و ئاسوودەی بۆ والاً ئەبێتەوە ..

( أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ ) .. ئەی ئادەمیزاد نازانێ ئەو رۆژەی گۆڕی مردوەکان هەڵئەدرێنەوەو ئیسك و پروسکی ناو ئەوگۆڕانە هەموو کۆدەکرێنەوەو ئەچنەوە دۆخی جارانی خۆیانەوە .

( وَحُصِّلَ مَا فِى ٱلصُّدُورِ ) .. وە هەرچی ئەو نهێنی و ئەو هەست و

نەستانەی لەخەڵکی ئەشاردرانەوەو بەدزی و لە پەناو پەسێردا ئەنجام ئەدران ، ئەوانە هەرهەمووی کۆ ئەکرێنەوەو ئامادەئەکرێن بۆ کاتی لێپرسینەوەو دادوەریی رۆژی قیامەت !

( إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ ) .. ئالەو رۆژەداو ـ لەهەموو کاتوساتێکیشدا ـ خوای گەورە ئاگاداری هەموو شتێکیانەو هیچی لێ ناشاردرێتەوەو سەرجەم کارو کردەوکانی مرۆڤ هەژماردەکاو ئەیخاتەوە پێش چاویان و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات ..!

*          *          *

سورەتی ( القارعة )

مەککیە .... یانزە ئایەتە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( ٱلۡقَارِعَةُ ) .. یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی کە زاراوەیەکە لێدان و داپڵۆسین و ترس پەخشدەکات .

( مَا ٱلۡقَارِعَةُ ) .. کەواتە ئەبێ ( القارعە ) چی بێت ؟

( وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ) .. تەنانەت تۆش نازانیت ( القارعە ) چییەو چۆنە؟

( يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ) .. ڕۆژێکە خەڵکی هەر هەموو وەکو پەپوولەی باڵگرتوویان لێدێ کە بە هەموو لایەکدا بڵاوئەبنەوەو خۆشیان نازانن بەرەو کوێ هەڵئەفڕن .

( وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٱلۡمَنفُوشِ ) .. ئەو کەژو کێوە چەسپیوو زەبەلاحانەش وەکو خوری شیکراوەیان لێدێت کە بە کزەبایەك بە هەوادا ئەچێ و پەرشو بڵاو ئەبێتەوە .

( فَأَمَّا مَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ ) .. جا ئەوەی کێشی کردەوە باشەکانی گرانبێ و کاری چاکی زۆری کردبێت لە ژیانیندا .

( فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ) .. ئەوا چارەنووسێکی باش مسوگەر دەکاو

ئەکەوێتە ژیانێکی پڕ نازو نیعمەتەوەو زۆر رازیە بەو بەخششە پیرۆزەی خوای خۆی .

( وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ) .. بەلام ئەو کەسەی کە کێشی کردەوە باشەکانی سووکەو بە دەستی بەتالەوە هاتۆتە بەر بارەگای خوای پەروەردگار .

( فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ) .. ئەوا ئەو کەسە ئەکەوێتە باوەشی ( هاویە )وەو ئەو جێگە سەخت و سامناکە ئەبێت بەدایکی و دالدەی ئەدات !

( وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ) .. کە تۆش نازانیت ئەو جێگایە چیەو چۆنەو لە کوێیە .

( نَارٌ حَامِيَةٌۢ ) .. کەواتە باوەشەکە بریتیە لە ئاگرێکی کلپەدارو سوتێنەر کە هەر خوا خۆی ئەزانێت لە کەیەوە ئاگری خۆشئەکرێ و بەچی جۆشدراوەو چ وزەیەکی سوتێنەری تیا حەشارداوە ..!

* * *

سورەتی ( التكاثر )

مەككیە .... هەشت ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

( أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ) .. هەر خولیای پارەو سامان كۆكردنەوەن .. ئەی مرۆڤی سەرگەردان و بێ ئاگا ، ئەی ئەوانەی هەرخەریكی پارەكۆكردنەوەو ماڵوسامانی دونیان و خەمی ماڵومناڵتان هەموو ژیانی لێداگیركردوون و دنیاویستی مەست وسەرخۆشی كردوون و ئاگاتان لە هیچ مانایەكی تری ژیان نەماوەو بەها بەنرخ و راستەقینەكانی ژیانتان بەلاوە ناوەو بۆ ساتەوەختێكیش رووی تێناكەن !!

( حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ) .. هەتا دێنە سەر لێواری گۆڕەكانتان هەروا بێ ئاگان و لەدنیای پارەپەرستی و خۆشیە كەم تەمەنەكانی ژیانی كورتاندا نوقم بوون و تا لوتتان نەیدا لەبەردی ئەلحەد بەئاگانایەنەوە ..!

( كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ) .. بەلام نا . هەر ئەبێ بزانن و تێبگەن .. خۆتان ئەبیننەوە چیتان بەسەردێ و ئەو رێگایەی گرتوتانەتەبەر بەرەوكوێتان ئەبات .

( ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ) .. نەخێر نەخێر ، بێگومان هەر ئەبێ بزانن و تێبگەن .. بێگومان بن كە ئەو رۆژەتان پیشان ئەدەین و پاشەڕۆژی ئەو رێبازی ژیانەشتان بەچاوی خۆتان ئەبینن و ئەو كارو كردەوانەشتان فریاتان ناكەوێ و چارەنووسی رەش و تاریكتان ناگۆڕێ ..!

( كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ ) .. نـەخێر .. گـەر بـە باشـی بتانزانیایـەو دڵودەرونتـان گومـانبڕ بکردایـە لـەو راسـتیانەی ژیـان و دڵنیـا بوونایـە لـە بەڵێنەکانی خوای پەروەردگار .

( لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ) ..ئەوا ئەوکاتە بێگومان سزای سەختی ئاگری دۆزەخ ئەهاتە پێش چاوتان و ئەتانزانی کەچارەنووستان تاریك و بێ هیوا ئەبێ و جەهەنەم چاوەڕێتان ئەکات .

( ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ) .. بـەڵێ ، ئـەو چـارەنوس و دواڕۆژە دژوارو پڕنائومێدیـە لەبەردەمتانـەو بەهەردووچـاوی سـەری خۆتـان ئـەیبینن .. بەجەسـتەو لاشەشـتان هەسـت بـە ئـازارە سـەختەکانی ئەکـەن و هـەموو کاتوساتێك ئەبێتە خۆراکتان و ئەیچێژن .

( ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ) .. بەڵێ ، پاشانیش لەدادگای پـڕدادوەری خـوای بالادەسـتدا لێپرسـینەوەتان لەگەڵـدا دەکرێـت ، لەسـەر هـەر کـارو کردەوەو نازو نیعمەت و دەستکەوتێکتان کە لـەژیانی دونیاتاندا بەدەستان هێنابێت یا ئەنجامتنان دابێ و تەمەنی خۆتان تیا سەرف کردبێ و ژیانتـان بـۆ تـەرخان کردبـێ .. ئـەو کاروکردەوانـەی کـە دووری خـستبوونەوە لـە خواپەرستی و بڕواداری و مرۆڤـ دۆستی .. کەواتە ئەبێ مرۆڤی ژیرودانا هەردەم هۆشیارو وریا بێت و ئاگای لە هەر هەنگاوێك بێت کە ئەینێت لە ژیـانی رۆژانەیـداو بزانـی کـە هێزێکـی بەتواناو بـە دەسـەڵات هەیـە ئاگـای لـە هـەموو کاروکردەوەیـەکێتی و لێپرسـینەوەی لەسـەر هـەر گـەورەو گـچکەیەك لەگەڵدا ئەکات و هیچی لیناشاردرێتەوە ..

سورەتی ( العصر )

مەککیە .... سێ ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

لـەم سـورەتە کورتـە سـێ ئایەتیـەدا بەرنامەیـەکی تـەواو بـۆ ژیـانی مرۆڤایـەتی پیـشان ئـەدرێت وەك ئـاینی ئیـسلام ئەیـەوێت .. هـەروەها بنـەماکانی بۆچـوونی ئیمـانیی راسـتەقینەش زۆر بـە وردی و زەقـی دیاردەکەوێت .. بە گشتی ئەو راستیە دەردەکەوێت کە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی تـەنها یـەك بەرنامەیـەی ژیـان سـەرکەوتوو براوەیـە ، ئەویش ئەو بەرنامە جوان و رێکەیە کە لەم سورەتەدا هێڵە سەرەکیەکانی دیاری کراوە ..

( وَٱلۡعَصۡرِ ) .. خوای گەورە سوێند بە کاتی عەسر دەخوات .. کە ئەوەش بەڵگەیەکە بۆ گرنگی ئەو کاتە لە ژیانی مرۆڤداو گرنگی ئەو بابەتانەش کە لەم سورەتەدا باسدەکرێن .

( إِنَّ ٱلۡإِنسَـٰنَ لَفِى خُسۡرٍ ) .. کە مرۆڤ رەنج بە خەسارو دۆڕاوە لە ژیانیدا

( إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ) ..

تـەنها ئەوانـە نـەبێت کـە بـاوەڕێکی پتـەوو تـەواویان بـە خـوای پـەروەردگار هێنـاوە ( کـە بـاوەڕبوون بـەخوای گـەورە بناغـەو بنـچینەی ژیانـەو هـەموو لقەکانی چاکەو چاکەخوازیش هەر لەوەوە سەرچاوەیان گرتوە ) . هەروەها کـارو کـردەوەی چـاك و سـوودبەخش ئـەنجام دەدەن ( کـە کـاری بـاش و کردەوەی چاکیش بەرهەمی سروشتیی و راستەوخۆی ئیمان و باوەڕهێنانە

بە خوای بالآدەست ) . پاشان هانی خەڵکی ئەدەن بەرەو رەفتاری دروست و ئاکاری بەرزو هەق پەیڕەوکردن لە ژیانی ڕوژانەیاندا و رێی ئارامگرتن و هێوری گرتنەبەر لە کارئەنجامدانداو سووربوون لەسەر رێگای راستی خواپەرستی و خواویستی .. لێرەشەوە ئەو راستیە دەرئەکەوێت کە ئیمان و باوەڕ سەرچاوەی هەمو شتێکی راست ودروستن لەم ژیانەداو سەرجەم لقەکانی تری خێرو چاکەخوازی هەر لەوەوە سەرچاوەدەگرن و ئەوەی پێچەوانەی ئەوەو دوورە لە رێنماییەکانی ئەو بێگومان سەرچاوەیان لە شەیتانەکانەوەیەو ئەڕژێنە خانەی بەدکاری و ملهوڕی و دوژمنکاری مرۆڤایەتیەوە ...

* * *

سورەتی ( الهمزة )

مەککیە .... نۆ ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

خوای گەورە لەم سورەتەدا دیمەنێك لەدیمەنەکانی دەرونی ئادەمیزاد نمایش دەکات کە لە قۆناغی یەکەمی بانگەوازو لە قۆناغەکانی دواتریشداو تا کۆتایی ژیانی مرۆڤیش لەم سەرزەویەدا ئەبینرێ و دووبارەدەبنەوە . دیمەنی کەسێکی بەدکارو توانج هاوێژی دەرون نزم ، کاتێ خۆشەویستی پارەوسامان هەموو دڵودەرونی داگیردەکاو وائەزانێ بەرزترین بەهای ژیانەو سەرجەم بەهاو شتەکانی دی هیچ نین لەبەرامبەریداو نرخیان کەمەو ئەبێ بەچاوێکی کەم سەیریان بکرێت ، جا بەهاکانی دی بەها مرۆییەکان بێت یاخود هی راستیەکان و شتە مەعنەویەکان بن .. هەروەها وائەزانێت ماڵوسامان هەموو شتێکی پێئەکرێ و تەنانەت نەمری و ژیانی هەتا هەتایشی پێ ئەکڕێت ! بەڵام خوای گەورە لەم ئایەتانەدا وەڵامی ئەو سەرمەستانە ئەداتەوەو راستیەکانیان زۆر بە راشکاوی بۆ نمایش دەکاو تێیان ئەگەیەنێت و ئەفەرموێت :

( وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ) .. سزای سەختی جەهەنەم بۆ هەرکەسێکە کەخەریکی توانج هاویشتن و پلارتێگرتن و باسکردنی کەم وکوڕیەکانی خەڵکیە ..

( ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ) .. ئەوانەی هەرخەریکی پارەکۆکردنەوەو

هەژمارکردنی ئەو پول و پارانەیانن و ئاگایان لە هیچ بەهایەکی بەرزی ژیان نەماوە .

( يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ) .. وائەزانن ئەو ماڵوسامانەیان هەموو شتێکە لە ژیانداو تەنانەت وا هەڵیخەڵەتاندوون کە بەهەموو ژیریی خۆیانەوە وائەزانن بەهۆی پارەی زۆریانەوەو ئیتر هەر ئەمێنن و مردن ناوێرێ رێیان لێبگرێت !

( كَلَّا ۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ) .. بەڵام نەخێر ، با چاك بزانن کە ئەوان و نمونەی ئەوانیش ـ کە بەو بیرو بۆچوونەوە ژیان ئەبەنەسەر ـ هەرهەموو فڕێ ئەدرێنە ناو ئاگری ( الحطمة ) وە . ئەو ئاگرەی هەر شتێك فڕێبدرێتە ناوی تێکی دەشکێنێ و ئەیتوێنێتەوە .

( وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ) .. تەنانەت تۆش نازانیت ئاگری ( الحطمة ) چیەو چۆنە ؟

( نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ) .. ئاگرێکە خوای گەورە خۆی خاوەنێتی و بە فەرمانی خۆی گڕوکڵپەی بڵێسەدارکراوەو ئامادەکراوە بۆسزای ئەو نەفامە بەدکارانە.

( ٱلَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ) .. ئاگرێك کە توانای ئەوەی دراوەتێ بزانێ چی لە دڵودەرونی ئەو کەسانەدا حەشاردراوە لە بەدکاری و ملهوڕی و لوت بەرزی و خوانەناسین ، تا شایانی ئەوەبوون ئەم جێگایە ببێتە مۆڵگەو چارەنووسیان !

( إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ) .. ئاگرێك کەهەر فڕێدرانە ناوی لەسەریان دادەخرێ و هاتنە دەرەوەیان بۆنیە .

( فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ) .. گڕو کڵپەو بڵێسەی بەرزو درێژەوەبووی ستوون ئاسا لەهەرچوارلاوە هەڵمەتیان بۆ ئەبا .. بواری دەربازبوون و قوتاربوونیان نامێنێ و ئەبێتە بارەگاو جێی حەوانەوەی هەموو کاتوسات و شەووڕۆژێکیان ..!!

لێرەدا دەرئەکەوێ کە قورئان ئاگای لە ڕووداوەکان بوەو پارێزگاری لە بانگەوازو لەهەڵگرانی کردوەو لەکاتی خۆیدا کارە نابەجێ و نەگریسەکانی دوژمنانی ڕیسواکردوەو ورەی موسوڵمانانیشی بەرزکردۆتەوەو هانی داون بۆ بڕوابەخۆبوون و ئارامگرتن لەسەر ئازاردان و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانیان و بەردەوام بوون لەسەر ئەرکی پیرۆزی بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان لەناو ئەو کۆمەڵگا سەرسەخت و کەللەڕەقەدا ..

* * *

سورەتی ( الفیل )

مەککیە .... پێنج ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ) .. ئەی نابینی خوای پەروەردگارت چی کرد بە لەشکری خاوەن فیلەکان ؟ .. ئەو لەشکرەی کە بەنیازی داگیرکردن و تێکدانی کەعبەی ماڵی خوا هێرشیان هێنابوو .. هەر لەبەر گەورەیی رووداوەکەو کاریگەریە شوێندیارەکانی ، ئەم پرسیارە سەرنج راکێشە ئەکات لە سەرەتای سورەتەکەدا ..! رووداوەکەش لەناو خەڵکی ئەو ناوچەیەدا زانراوو ئاشکرابوو . کە کردبوویانە نیشانەیەك بۆ دیاری کردنی مێژوو بەرواری رووداوەکانی تریشیان ، بۆنمونە ئەیانوت : لە ساڵی فیلدا ئەوەو ئەوە رویدا . یاخود پێش یا دوای ساڵی فیل ئەوە رویدا ، وە ئەوەش بەناوبانگە کە لەدایکبوونی پێغەمبەر (ﷺ) هەر لەو ساڵەدابوە ، ئەوەش لەخۆیدا یەکێکە لە کارە جوان و بێ وێنەکانی خوای بالأدەست !

( أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ) .. ئەی پیلان و نەخشەکانی هەموو هەڵوەشاندنەوەو پووچەڵی نەکردنەوە .. سەری لێشێواندن و بەو ئاوات و ئامانجەش نەگەیشتن کە بۆی هاتبوون و نەخشەیان بۆ دانابوو ؟! خوای گەورە لێرەدا ئەیەوێت ئەم رووداوە بهێنێتەوە بیری قورەیشیەکان کە چۆن هەرخوا خۆی ئەتوانێ ماڵی پیرۆزی خۆی بپارێزێ و ، ئەوان لەگەڵ ئەو لەشکرە گەورەیەدا هیچیان پێنەئەکراو دەستەو وەستان راوەستابوون .

بۆیه ئەمجارەش لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا هیچیان پێناکرێ و خوای مەزن خۆی چی بوێت هەر ئەوە ئەبێ و هیچی تر ..!

( وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ) .. ( ابابیل : یانی پۆل پۆل ) ..هەروەها جۆرێك له باڵندەی بۆناردن که پۆل پۆل بەسەریاندا ئەهاتنە خوارێ و ئەیان تۆقاندن .

( تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ) .. ( سجیل : وشەیەکە بەمانای بەردو قوڕ دێت ) .. هەر ئەو باڵندانە جۆرە بەردێکیان تێئەگرتن کە لە قوڕی سورەوەکراو دروستکرابوون و دەسەلآتی خۆپاراستنیشیان نەبوو کە نەیەڵن بەر سەریان بکەوێت .

( فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ) .. (عصف : یانی گەلآی داری وشکەوەبوو )

له ئەنجامی ئەو بەردبارانکردنەشدا هەموو وەك گەلآی داری وشکەوەبوویان لێهات .. که پارچەپارچەو وردو هەراش ئەبێت کاتێ مارومێروو ئەیانخۆن و لەناو دەمیاندا ئەیانهاڕن . ئەمەش ئاماژەکردنێکه بۆسەرەنجامی هەرهێزێکی ملهوڕو ستەمکار گەر بیەوێت لەبەرامبەر دەسەلآتی خوادا رابوەستێ و رێ له بلآوبوونەوەی بەرنامەو ئاینی خوا بگرێت .

*     *     *

سورەتی ( قریش )

مەککیە ... چوار ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

خوای گەورە لەم سورەتەدا ئەو بەخششانەی خۆی بیری هۆزی قورەیش ئەخاتەوە کە کاتی خۆی چۆن رزگاری کردوون لە هێرشە دڕندانەکەی ئەبرەهەو پاشانیش ئەو ناوچەیەی بۆ هێمن و ئارام کردوون و بە ئاسودەیی بازرگانی خۆیان کردوە و بژێوی ژیانی خۆیان بە ئاسانی دابین کردوە .

( لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ) .. لەبەر هۆگری و ئالودەبوونی هۆزی قورەیش .

( إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ) .. هۆگرییان بە هاتوچۆی ئارام و ئاسوودەی کاروانەکانی بازرگانی هاوینەو زستانەیان کە لە نێوان ناوچەکانی شام و یەمەن و نیوەدورگەی عەرەبیدا ئەنجامیان ئەدا .

( فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ) .. کەواتە با ئەوانیش ئەو نازو نیعمەتانەیان لەبەر چاوبێ و سپڵەو بێ وەفا نەبن و رووبکەنە خواناسین و خوای ئەم ماڵە پیرۆزە بپەرستن ( مەبەستی لە کەعبەی پیرۆزە ) .

( ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ) .. ئەو خوایەی دوای برسیەتی و نەدارایی ، وای کرد ــ بە بۆنەی هاتنی خەڵکی لە هەموو لایەکی دنیاوە بۆ سەردانی ماڵی خواو حەجکردن ــ جۆرەها بەروبووم و خواردن لە گەڵ خۆیان بهێنن و خەڵکی ئەم ناوچەیەش لە برسێتی رزگاریان

ببێ و تێرو ته‌سه‌ل بن و ناوچه‌که‌شیانی ئارام کردو رزگاری کردن له ترس و له‌رزی رێگرو پیاو خراپان .

* * *

سورەتی ( الماعون )

مەککیە .... حەوت ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ئەم سورەتە چمکێك لە راستیەکانی ئیمان و باوەڕ روون ئەکاتەوە ، کە بریتیە لەوەی ئەم ئاینە ئاینی روخسارو رووکەش نیەو بەتەنها روالەتی پەرستن و عیبادات سوودی نیە گەر لە دلسۆزی و خۆبەختکردنەوە سەرچاوەیان نەگرتبێت . کە دواتر هاندەرو پالنەر بن بۆ ئەنجامدانی کردەوەی چاك و سوودبەخش و رەنگبداتەوە لە رەوشت و ئاکاری بەرزو خاوێندا و سەرەنجام هۆکاربن بۆ سەرفرازی و گەشەکردنی ژیانی ئادەمیزاد لەسەر ئەم زەویەدا ..

( أَرَءَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ ) .. ئایا ئەو کەسەت نەبینیوە کە دین و ئاین بە درۆ ئەخاتەوەو باوەڕی بە دەسەلاتی خوای گەورەو بە پەیامی پێغەمبەریش نیە (ﷺ) .

( فَذَٰلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ ) .. نەك هەر ئەوە بەلکو بەزەیی بە منالە بێ باوکەکانیشدا نایەتەوەو لایان بەلادا ناکاتەوە و رووی خۆی گرژئەکات بەرامبەریان .

( وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ) .. نەخۆی دەسگیرۆیی هەژاران دەکاو نە هانی خەلکیش ئەدات بۆ تێرکردن و یارمەتیدانی هەژارە دەستکورتەکان .

( فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ) .. پاشان سزای سەختی دۆلە ئاگرەکانی جەهەنەم بۆ

دەستەیەك لە موسوڵمانی نوێژخوێن .

( ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ) .. ئەوانەی کە ئاگایان لە نوێژەکانیان نیەو نازانن چی ئەڵێن و چی ئەخوێنن .

( ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ) .. کە بۆ ناوو خۆدەرخستن نوێژ ئەکەن و بە دڵودەرون و هەستونەستیان ئاگایان لە نوێژەکانیان نیە ..

( وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ) .. ئەوەش ئەبێتە هۆی ئەوەی قرچۆك و گیرفان قوڵ و ڕژدو دەست نوقاو بن و دەستی یارمەتی درێژ نەکەن بۆ هەژارە بێ دەرامەتەکان و خواردنیان نەدەنێ تا پێی تێربن و کەمێك لە ئازارە دەرونیەکانیان بڕەوێتەوە .. کە ئەم سیفەتانە بەگشتی پێچەوانەی سروشتی ئەم ئاینەن و دوورن لەو ڕەوشتە بەرزو شارستانیانەی بەرنامەی پیرۆزی ئیسلام هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنیەوە بەرپای کردن و باوەڕدارانی هان ئەدا بۆ پیادەکردنی و بیکەنە دروشم و مۆرکی ڕەسەنی خۆیان ، تا سەرەنجام ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بەدەست بێنن و بچنە ڕیزی ئەو موسوڵمانانەی بوونەتە سەرقافڵەی کاروانی ئیمانداران بەدرێژایی مێژووی ئەم ئاینە پیرۆزە ..

* * *

سورەتی ( الكوثر )

مەککیە .... سێ ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

ئەم سورەتە هەروەك سورەتەکانی ( الضحى ) و ( الشرح ) بە تایبەت لەبەر خاتری پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) هاتۆتە خوارێ و خوای گەورەو میهرەبان دڵنەوایی ئەکاو بەڵێنی خۆش وگەورەی ئەداتێ و ئاراستەی ئەکات بەرەو رێگای سوپاس وستایشکردنی خوای پەروەردگارو هەرەشەش لە دوژمنەکانی دەکاو بەڵێنی تۆڵەسەندنەوەیان ئەداتێ .. هەروەها ئەوەش ئاشکرادەکات کە ژیانی بانگەوازو بانگەوازکاریش هەر لە سەرەتاوە بریتی بووە لە بەرەورووبوونەوە لەگەڵ چەندین تەنگوچەڵەمەو ئازارو ئەشکەنجەو دەربەدەری ، کە لەگەڵ ئەوانەشدا خوای گەورە ئاگاداری رووداوەکانەو پشتی شوێنکەوتوانی ئاینەکەی بەرناداو مژدەو بەڵێنی خۆشیان ئەداتێ تا زیاتر پابەندبن بە بەرنامەی خواوەو چاوبڕنە خەڵات و پاداشتی خوای پەروەردگاریان و تاڵی و ناخۆشی ئەم ژیانەیان لەبیر بچێتەوەو بەلایانەوە سەخت و گران نەبێت ..

( إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ) .. ئێمە بەخشش و نازو نیعمەت و بەهرەی زۆرمان پێ بەخشیویت .. پلەوپایەیەکی بالاو بێ وێنەمان داویتێ کە بەو شێوازە بەکەسی ترمان نەبەخشیوە ، کە ئەم قورئانە پیرۆزە بالاترین ئەو بەخششانەیە لە ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ) ، جگە لە پلەوپایەو بەخششەکانی رۆژی قیامەت و ئەوانی ناو بەهەشتیش .

( فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ) .. کەواتە تۆش ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) رووبکەرە بارەگای پەروەردگاری خۆت و بەوپەڕی هێزو تواناتەوە بیپەرستەو سوپاس وستایشی بکەو قوربانیی پێشکەش بکەو، ئەوەی لە تواناتایە پێشکەشی بکە بۆ رێگای خواناسین و گوێ مەدەرە تیروتوانجی دوژمنان و ناحەزانت .

( إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ) .. دڵنیا بە لەوەی ئەوانەی تیروتوانجت تێئەگرن هەر ئەوان وەجاخ کوێرو تەمەن کورتن و هەر زوو ناویان لە سەر دنیادا ئەسڕێتەوە .. بە پێچەوانەشەوە یادو ناوی تۆ هەتاهەتایە هەرئەمێنێ و سەرجەم مرۆڤایەتی لەکانیاوی چاکەو خێری دەستی تۆ نۆش ئەکەن .. ئەم ئایەتەش ئاماژەیەکەیە بۆ ئەوەی کە بانگەوازکردن بەرەو خواویستی و بەرەو هەق وراستی هەرگیز تەمەن کورت و دوابڕاو ناکات . چونکە ئەو رێبازە راستەوخۆ پەیوەستە بە خوای تاکوتەنهای هەردەم زیندووی نەمرو ئەزەلیەوە .. بەڵام بێ باوەڕی و گومڕایی و شەڕو نەفامیی دوابڕاوو تەمەن کورت و فەوتاوە ، با لە ساتێك لەساتەکانی تەمەنی کورتیشیدا گەورەو دیارو چەسپیویش خۆی پیشانبدات ..

* * *

سورەتی ( الكافرون )

مەككیە ...شەش ئایەتە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

( قُلۡ ) .. خوای گەورە بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ : بڵێ .. كە ئەمە فەرمانێكی خوایی یەكلاكەرەوەیە ، ئەوە دەگەیەنێت خاوەنی ئەم بیروباوەڕە هەر خوای بالأدەست خۆیەتی بەتەنها ، تەنانەت موحەمەدیش هیچی بەدەست نیە تیایدا ، بەڵكو بەتەنها هەرخوای گەورە خۆی فەرمانڕەواو بالأدەستە كە فەرمانە بالأكانی گەڕانەوەیان بۆ نیەو هەر ئەو كاربەدەستە بالأیەیە فەرمان و داواكاریەكانی ئەنجامدەدرێن و ڕەتكردنەوەیان بۆنیە ..

( قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ) .. بڵێ ئەی ئەوانەی بێ باوەڕن و فەرمانەكانی خوای پەروەردگارتان بەلاوەناوەو بە چاوی نزم سەیری دەكەن .. هەر بە سیفەت و ئاكارە سروشتیەكەی خۆیان بانگەوازیان دەكات .. ( الكافرون ) كەهیچ دین و ئاینێكیان نیەو بەهیچ شێوەیەك و لەسەرهیچ ڕێگایەك لەگەڵ تۆدا یەك ناگرنەوەو دوورن لەیەكدی ..

بەم شێوەیە سەرەتای سورەتەكەو دەستپێكی وتارەكە ڕاستی و چۆنیەتی لێكترازان و جیاوازیەكە ڕادەگەیەنێت .. كە هیچ بەیەك گەیشتنێك لەنێوانیاندا نابینرێت !

( لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ) .. پەرستراوی من جیاوازە لە پەرستراوانی ئێوە و .. پەرستنی من جیاوازە لەپەرستنی ئێوە .

( وَلَآ أَنتُمۡ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ) .. پەرستراوی ئێوە ئەو پەرستراوەی من نیە و .. پەرستنی ئێوە جیاوازەو لە پەرستنی من ناچێت

( وَلا أَنَاْ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمۡ ) .. هەروەها منیش ئەو خوایە ناپەرستم کە ئێوە ئەیپەرستن .. لێرەدا تەئکید لە ماناکەی پێشووتر دەکاتەوەو سیفەتی بەردەوامیی ئەدات بەو مانایانەو ئەو عەقیدە توندو تۆڵە لە ناو دڵودەرونی موسوڵماناندا ئەچەسپێنێت ..

( وَلا أَنتُمۡ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ) .. وە ئێوەش ئەو خوایە ناپەرستن کە من ئەیپەرستم .. لێرەشدا چەسپاندنی مانای دووەم نمایش دەکا ، تا هیچ گومان و دوودڵیەك نەمێنێت ، بەڵام چۆن دوودڵی و گومان ئەمێنێت دوای ئەو تەئکیدکردن و دووبارەکردنەوەو بڕیاردانە کە بەهەموو ئامرازەکانی بڕیاردان و دووبارەکردنەوە کێشەکە یەکلا ئەکاتەوە و بەتەواوی و بە راشکاوی ئاشکرای ئەکات !

( لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ) .. ئێوە دین و ئاینی خۆتان هەیەو منیش دین و ئاینی خۆم .. من لێرەم و ئێوەش لەوێ ، بۆیە نەهیچ پردو بەردەبازو رێگایەك نیە بمان بەستێت بەیەکەوە .. جیابوونەوەیەکی تەواوو سەرانسەری و لێکترازانێکی روون و وردو ئاشکرایە ..

ئەم جیابوونەوەیە زۆر پێویست بوو بۆ روونکردنەوەی خاڵە

سـەرەکیەکانی لێکنەچـوون و جوداکانیـان ، کـە هـەرگیزو لەسـەر هـیچ بنەمایـەك لـەنیوەی ڕێگـادا بەیـەك ناگـەن .. لەیـەك نەچـوون لـەکرۆکی بیروباوەڕداو ، لە بناغەی بۆچوونەکانیانداو ، لە شێوازو چۆنیەتی بەرنامەو ئاراستەی ڕێگاکانیاندا .

یەکخواپەرستی بەرنامەیەکەو ، فرەخواپەرستیش بەرنامەیـەکی تـر .. بەیەکتر ناگەن .. جاهیلیەت هەر جاهیلیەتەو ، ئیسلامیش هەر ئیسلامە .. جیاوازیـەکی گـەورە هەیـە لـە نێوانیانـدا .. ڕێگـە چـارەش هەرئـەبێ خۆدەربازکردن بێت لە ژیانی جاهیلیەت و هەنگاونان بەرەو ژیانی خاوێن و بڵندی ناو ئیسلام .. ئەبێ بانگەوازکار کاتێ لەناو خەڵکان و کۆمەڵگایەکی دوور لـە راسـتیەکانی ئیـسلام دەژی هـەوڵی خۆجیاکردنەوەبـدات ، خۆجیاکردنەوە بەهەست ونەست و بۆچوونەکانی نەك بە جەستەو ژیانی رۆژانەی .. بەهەست و نەستی خۆی دورەپەرێز بگرێت لەشێوازی ژیان و بیروباوەڕو بۆچوون و بەرنامەی کاری جاهیلیەت . بە جەستەش لەناویاندا بژی و هەوڵی ڕێنمایی و پەڕینەوەیان بدات بەرەو کەنارەکانی سەرفرازیو بەختەوەری ..

بانگەوازکارانی ئەمڕۆی ئیسلام چەند پێویستیان بەم تێگەیشتنە روون و ئاشکراو یەکلاکەرەوە هەیە . کە ئەوان ئێستا بۆچوون و بەرنامەی ئیسلام سەرلەنوێ بنیات دەنێنەوەو لەناو کۆمەڵگاو دەوروبەرێکی لەڕێ لادراودا دەژین . لەناو خەڵکانێکدان کە لە ژیانی پێشوویاندا ئەم بیرو بۆچوون و بەرنامەی ژیانەیان ناسیوە ، بەڵام بەهۆی تێپەڕبوونی کات و ماوەیەکی زۆر بەسـەریاندا ئێـستا زۆریـان لـە ڕێبـازە راسـتەکە لایانـداوەو خەریکـە نایناسنەوەو دڵودەرونیان پەردەی نەفامی و نەزانی بەسەردا هاتووە .

بۆیــە بــەبێ ئــەم خۆجیاکردنــەوەو خۆناســینەوەیە ، ئــەم تــەم ومــژە هــەردەمێنێ و راســتیەکان ئەشــێوێن و تێکــەڵاو ئــەبن و هــیچ پینــەکردن و موتوربــەکردنێکیش ناماندگەڕێنێتــەوە ســەر راستەشــەقامی ئیــسلام و بیروبــاوەڕە روون و ئاشــکراکانی .. بانگــەوازکردنیش بــۆ ئیــسلام هــەرگیز لە سەر بنەمای نامۆو لاوازو بێ بناغە سەرناگرێ و بەردەوام نابێت . بەڵکو تەنها لە سەر بنەمای رای چەسپاوو راشکاویی و روون و ئاشکرایی خۆی دەگرێــت و ســەرئەکەوێت و بــەروبوومی پــڕو پێگەیــشتوی بەدەســت دەهێنرێت...

*      *      *

سورەتی ( النصر )

مەککیە .... سێ ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

ئـەم ســـورەتە مژدەیـــەکی خۆشـــی لـــە دووتوێدایـــە بـــۆ پێغەمبـــەری خۆشەویـست (ﷺ) بـەو سـەرکەوتنەی لـە لایـەن خـوای گـەورەوە خـەڵاتی دەکرێـت وە بـەوەی کـە خـەڵکانێکی زۆر دەستەدەسـتە دێنـە نـاو ئاینـە نوێکەوەو ئاینی ئیسلام لە پانتایی دورگەی عەرەبیدا بڵاوئەبێتەوە ..

( إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ) .. گەر لە لایەن خوای بالآدەستەوە سەرکەوتنت بەدەسـت هێنـاو شـاری مەککـە کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتتەوە و لـە دوژمنـان پاککرایەوە .. هەندێ لە زانایانی تەفسیریش ئەڵێن ئەم ئایەتە هێمایەکە بۆ نزیکبوونەوەی کۆتایی هاتنی تەمەنی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) .

( وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ) .. وە خـــەڵکی دەســـتە دەسـتەو پـۆل پـۆل روویـان کـردە ئـاینی خـواو باوەڕیـان بە بەرنامـەی خـوا هێناو دڵودەرونیان بەو پەیامە نوێیە رۆشن و ئاوەدان بۆوە .

( فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا ) .. ئـەوا لـەو سـاتە پـڕ شـکۆداریانەدا سـوپاس و ستایـشی خـوای پـەروەردگارت بکـەو داوای لێخۆشبوون و چاوپۆشیکردنی ئەو بکە لەگوناهەکانت ، چونکە هەر ئەوە لێبـوردەو دڵفراوان و نـەرم ونیانە لەگەڵ بەنـدە دڵسۆزەکانی خۆیداو ، هـەر ئـەو ئـەتوانێ لـە بەنـدە پەشـیمانبوەکان خۆشـبێ و پاکیـان بکاتـەوە لـە

گوناهەکانیان ..

له سەرەتای سورەتەکەدا بۆچوونێکی ڕەسەنی ئیسلامی دەردەکەوێت کە هەر ڕووداوێك لەم گەردونەدا ڕوودەدات ـ وە لێرەشدا ئەو سەرکەوتن و بڵاوبوونەوە بەرفراوانەی دینی خوا ـ نە پێغەمبەرو نە موسوڵمانانیش هیچ ڕۆڵێکیان نیە تیایداو خوای باڵادەستی بەتوانا هەر خۆی دیاردەو ڕووداوەکان کۆنترۆڵ ئەکاو بۆ چ مەبەستێکی بوێت ئاوا ئاراستەی دەکات و ئیتر ئەوان بەگشتی ئامرازێکن بۆ ئەنجامدانی ئەو ویستە باڵایانە و داوای هیچ دەسکەوتێك بۆ خودی خۆیان ناکەن ، مەگەر وەك ڕێزلێنان و پایە بڵندکردنێك ئەو ئالأی سەرکەوتن و ئەمانەتەیان ئەداتە دەست و دەیانکاتە پاسەوان و پارێزەری بەرنامە پیرۆزەکەی ..

* * *

سورەتی ( المسد )

مەککیە .... پێنج ئایەتە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ئـەم سـورەتە بـۆ ئـەوە هاتـەخوارێ تـا وەلاّمدانەوەیـەك بێـت بـۆ ئـەو جەنگەی کە ئەبولەهەبی مـامی پێغەمبـەرو ژنەکەی رایانگەیاندبوو لـە دژی ، بـەلاّم خـوای بالاّدەسـت خـۆی راسـتەوخۆ رۆڵـی پـارێزەرو سەرپەرشـتیاری پێغەمبـەری بینـی . ئەبولەهـەب هـەر لـە یەکـەم رۆژی بانگـەوازەوە ئـەم هەڵوێـستە دوژمنکاریـەی وەرگرتبـوو بەرامبـەر پێغەمبـەری ئـازیز ( ﷺ ) .. ئەوەبوو پێغەمبەر ( ﷺ ) بەیانیەك روودەکاتە دەرەوەی مەککەو ئەچێتە سـەر چیایەك و بەدەنگی بەرز خەڵکی ئەوشـارە بانگ ئەکات تا بێن بۆلای ، ئیتر خەڵکێکی زۆری قورەیش لێی کۆئەبنەوە ، ئەویش ئەفەرموێت : باشە ئەگەر من ئێستا پێتان بڵێم وا لەشکری دوژمنتان ئەم بەیانیە یا بۆ ئێـوارە ئەگاتـە سەرتان باوەڕم پێئەکەن ؟ وتیـان : بێگومـان باوەڕت پێئەکـەین . فەرمووی : دە بزانن من لە لایەن خوای گەورەوە نێردراوم کە ئاگادارتان بکەمەوەو سزاو ئەشـکەنجەیەکی سـەخت چـاوەڕێتان دەکـات گـەر بـاوەڕم پێنـەهێنن . لـەو کاتـەدا ئەبولەهـەب هەڵیدایـەو وتـی : دەك لـەناو چیت ، ئـا بـۆ ئەمـە ئێمـەت کۆکردەوە .. ئیتر خوای مەزن ئەم سورەتەی ناردەخوارێ .

( تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ) .. هـەردوو دەسـتی ( ئەبولەهـەب ) بـشکێ و بـە برین چێ وەکوچۆن شـکاو لەناو چـوو .. لـەم ئایەتـەدا خـوای گـەورە زۆر لـە ( ئەبولەهـەب )ی مـامی پێغەمبـەر تووڕەیـە لـە ئـەنجامی ئـەو ئـازاردان و بـە

چاوی سووك سەیرکردن و قسە ناشرینانەی لە رووی پێغەمبەری ئازیزدا ئەیکرد (ﷺ) ، بۆیە ئەم دوعا گەورەیەی لێدەکات .

﴿ مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴾ .. ئەو ماڵوسامانەش کە چەند ساڵ بوو کۆی کردبۆوە نەیانتوانی فریای کەون و رزگاری کەن لە سزاو ئەشکەنجەی رۆژی لێپرسینەوەو دادوەری ، کە رۆژی قیامەتە .

﴿ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴾ .. لە سزای ئەوکاروکردەوانەیدا ئەبێ بخرێتە ناو ئاگرێکی کڵپەداری سوتێنەری داپڵۆسێنەرەوە .

﴿ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴾ .. ژنەکەشی کە بارەدارو دڕکوداڵی ئەخستە سەر رێی پێغەمبەر بە مەبەستی ئازاردانی ، ئەویش هەمان چارەنووسی سەخت چاوەڕێی دەکات .

﴿ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴾ .. کە گوریسی ئاگرین ئەخرێتە گەردنی و پێی رائەکێشرێتە ناو دۆڵە ئاگرینەکانی جەهەنەمەوە .

*　　*　　*

سورەتی ( الاخلاص )

مەکیە ...چوار ئایەتە

بسم الله الرحمن الرحیم

ئەم سورەتە کورتە بەرامبەر سێیەکی قورئانی پیرۆزە ، هەروەك لە فەرمووده راستەکاندا هاتووە ، کە لە پێغەمبەرەوه ( ﷺ ) ئەگێڕنەوە فەرموویەتی :

(( سوێند بەوخوایەی گیانمی بەدەستە . بەرامبەر سێیەکی قورئانە )) ..

( قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ) .. (( احد )) زارەوەیەکە لەگوزارشی (واحد) وردترەو مانای بوونێکی تاکو تەنهایە .. کەهیچ بوونێکی راستی تر نیە ئەو نەبێ ، وه هەموو بوونێکی دی بوونی تەواوی خۆیان لەو بوونە راستەقینەیەوە وەردەگرن ، هەروەها مانای کارای تاك و تەنهاش دەبەخشێت ، چونکە هەر هێزێکی دی لەم بوونەوەرەدا نە هیچ کارێکی پێ ئەنجام ئەدرێت و نە کاریگەریشی هەیە تەنها ئەو خۆی نەبێت .. ئیتر ئەم مانایانە بیرو باوەڕێکن لەنێو ویژداناو راژەی هەموو راستیەکانی بوونەوەریش دەکات .. جا ئەگەر ئەم راژە کردنە چەسپاو ئەم بۆچوونە روون و ئاشکرا بوو ، ئەوا دڵودەرونی مرۆڤ لەسەرجەم تەم ومژو گەردەکانی ناوەوەی خاوێن دەبێتەوەو ئاسۆی رۆشن و روناك ئەبێتەوە .

هەروەها دڵی مرۆڤ سەربەست دەبێت لە خۆبەستنەوە بە هەر هێزێك جگە لەو هێزە تاکوتەنهایە نەبێت ، تاکوتەنها لەبوون و لە کارایی و لە کارئەنجامدانیشیدا .. لەم ساتە ئاسکانەدا دڵودەرون سەر بەخۆ دەبێ و

رزگـاری ئـەبێت لەسـەرجەم کـۆت و بەنـدە قورسـەکانی .. رزگـاری ئـەبێت لەکۆتی ئارەزوەکانی ، لەکۆتی ترسەکانی ، کە ئەم دوانەیان سەرچاوەی زۆربەی کۆت و زنجیرەکانێتی .. ئەمەش ئەو راستیەیە کە قورئانی پیرۆز گرنگیـەکی زۆری پێـداوەو خـستوێتیە نـاو کرۆکـی بۆچـوونی ئیمـانیی راستەقینەوە .. هـەر ئالێرەشـەوەیە کە بەرنامەیـەکی تـەواو بۆژیـانی مرۆڤـ سـەر هەڵئـەدات .. بەرنامەیـەك بۆپەرستنی خـوای گـەورە بەتـەنها .. ئـەو خوایەی کە هـیچ ویـستێك جگە لەویـستی ئەو کاریگـەری نیـەو ناتـەواوە . بەرنامەیـەك بـۆ رووکردنـە لای خـوای تاکوتـەنها لـەئاوات و ئارەزوەکـان و لەترس و لە دڵەڕاوکێ یەکانیشدا . لە خۆشی و لە ناخۆشیشدا .

بەرنامەیەك بۆ فەرمان وەرگرتن تەنها لەخوای تاکوتەنها ، وەرگرتنی بیرو بـاوەڕ و بۆچوون و بـەهاو نرخـەکانی یاسـاو رژێمـەکانی رەوشـت و ئاکـارو هەڵسوکەوتەکان .. بەرنامەیەك بۆ ئاڕاستەکردنی جوڵە و کارکردن کە تـەنها بۆخـوای تاکوتـەنها بێـت . بەرنامەیـەك دڵـودەرونی مرۆڤـ دەبەسـتێت بەسەرجەم بوونەوەرەکانی ترەوە ، بە پەیوەندی خۆشەویستی و دڵنیـایی و سۆزو نەرم و نیانی دەربڕین لەگەڵیاندا ..

ئەمـەش بەرنامەیـەکی سـەربەخۆو باڵایـە . زەوی لەروانگەیـدا بـچوکەو ، ژیـانی سـەر زەوی کورتـەو خۆدەربـاز کـردن لـە کـۆت و بەنـدەکانی دەبێتـە ئاوات و ئامانج ، بێ هـیچ گۆشە گیری و پـشت گـوێ خـستنێك ، بێ رق لێ بوونەوەو هەڵاتنێك .. بەڵکو پڕە لە هەوڵوکۆشـشی بـەردەوام بۆسـەرفرازی و پێشەوەچوونی سەرجەم مرۆڤایەتی... هـەروەها یـەکێك لـە بنـەماکانی تـری بریتیـە لـە جێنـشینی و سـەرکردایەتی مرۆڤایـەتی بەهـەموو مانـدوبوون و ئەرکەکانیشیەوە .

ئیتر هەر لەپێناو ئەو هەموو ئامانجانەدا بوو کە بانگەوازی یەکەم بەتەنها خەریکی چەسپاندنی راستی یەکخوا پەرستی بوو لە نێو دڵودەرونەکاندا بەو شێوازە جوانەی ، چونکە بەرنامەی یەکخواپەرستی هەمووکات هەر بەو شێوازە ئەبێتە بیرو باوەڕێکی راست و روون لەناو ویژدانی مرۆڤداو ئەبێتە راژەیەك بۆ ئەم بوونەو دەبێتە بەرنامەی ژیان .

( ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ) .. ( الصمد ) لە زمانەوانیدا بەمانای ئەو گەورەیە دێت کە پەنای بۆ دەبرێ و بەهانای خەڵکیەوە دێت ، وە بێ رەزامەندی ئەو هیچ کارێك ئەنجام نادرێت .. خوای گەورەش هەر خۆی ئەو گەورە هێزەیە و هەر خۆی تاکوتەنیاو بێ وێنەیە لە خواوەندێتیداو بوونەوەران سەرجەم بەندەی ئەون .. هەرخۆشی بە هانای داخوازیەکان و داواکاریەکانیانەوە دێت ..

( لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ) .. نە کەسی لێ بوەو نەکەسیشی لێدەبێت .. راستیی بوونی خوای پەروەردگار بەڵگەنەویستەو هەتاهەتاییە ، هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت و ، لەگشت بارەکانیدا سیفاتی تەواویی و رەهای لەگەڵدایە، بەلأم لەدایکبوون و سەرهەڵدان بەدواهاتنی لەگەڵدایە ، بوونێکە لەپاش نەبوون سەری هەڵداوە ، کە ئەو سیفەتانە بۆخوای گەورە مەحاڵەو نادروستە..!

( وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ) .. هیچ وێنەو هاوتاو هاوشانیشی نەبووە .. نە لەشێوازو راستیی بوونیداو نە لە شێوازی کارایی و باڵادەستیشیدا ..

کەواتە ئەم سورەتە چەسپاندن و بڕیاردانی بیروباوەڕی یەکخواپەرستیە لە ئیسلامدا ، هەروەك چۆن سورەتی ( الکافرون ) بڕیاری لەیەك نەچوون و

یەکنەگرتنەوەی ڕاگەیاند لەنێوان بیروباوەڕی یەکخواپەرستی و بیروباوەڕی فرەخواپەرستیدا ..

هەرلەبەر ئەو مانایانەش بوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرەتای هەموو ڕۆژێکی ــ لە نوێژی بەیانیدا ــ بە خوێندنی ئەم دوو سورەتە دەست پێدەکرد .. کە ئەم دەسپێکەش ماناو مەبەستی تایبەتی خۆی پەخشدەکات لە ژیانی باوەڕداراندا ..

* * *

سوره‌تی ( الفلق )

مه‌ككیه .... پێنج ئایه‌ته

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

ئه‌م سوره‌ته‌و سوره‌ته‌كه‌ی دواتریش ئاڕاسته‌كردنێكه له‌لایه‌ن خوای بالاده‌سته‌وه ، سه‌ره‌تا بۆ پێغه‌مبه‌رو (ﷺ) دوای ئه‌ویش بۆ سه‌رجه‌م موسوڵمانان كه په‌نا ببه‌نه به‌ر هێزو ده‌سه‌ڵاتی ئه‌وو خۆیان به‌و بپارێزن له زیانی هه‌موو شتێكی ترسناك . دیار بێت یا نادیار ، زانراو بێت یا نه‌زانراو..

( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ) .. خوای گه‌وره به پێغه‌مبه‌ر ئه‌فه‌رموێت ( ﷺ ) : بڵێ په‌نا ئه‌به‌مه به‌ر په‌روه‌ردگاری به‌ره‌به‌یان .. ( فلق ) به‌مانای به‌ره‌به‌یان یاخود بوونه‌وه‌ریش دێت .. هه‌ر شتێك كه بوون و ژیانی لێوه په‌یدا ببێت .. گه‌ر به‌مانای به‌ره‌به‌یان بێت ، ئه‌وا په‌نابردنه به‌ر خوای به‌ره‌به‌یان به‌و ڕۆشنی و سانایی‌یه‌ی ، دڵنیایی و ئاسووده‌یی په‌خش ئه‌كات له‌ترسی هه‌ر دیارده‌یه‌كی نادیارو شاراوه .. وه گه‌ر به مانای بوونه‌وه‌ربێت ، ئه‌وا په‌نابردنه به‌ر خوای بوونه‌وه‌ران له‌ناو دڵوده‌روندا دڵنیایی دروست ده‌كا به‌رامبه‌ر خراپه‌كاری ئه‌و بوونه‌وه‌ره‌انه ...

( مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ) .. په‌نا به‌خوا بگره له خراپه‌كاری سه‌رجه‌م بوونه‌وه‌ران ــ به وردو درشتیانه‌وه ــ .

( وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ) .. ( الغاسق ) یانی هه‌ڵقوڵین .. ( الوقب ) یانی

ئـەو کونـەی لەشـاخێکدا بێـت و بـەخوڕ ئـاوی لێ بێتـە خـوارەوە .. لێـرەدا مەبەسـتی لـە شـەوگارە ، ئـەو شـەوە تاریکـە ئەنگوستەچاوەی کـە تـاریکی لێهەڵدەقوڵێ و سەرزەوی دائەپۆشـێ . کە لەگەڵ خۆیـدا زۆرشت و دیـاردەی پـەنهان و نادیـار رادەکێـشێت .. لـە دڕندەی ترسـناك و ، دزی هەڵپەکـەرو . دوژمنـی خۆ متکردوو ، یا مێرووی ژەهراوی و ، دڵەڕاوکێ و خەم وخەفـەت . کە شەوانە بەردەوام دزەئەکەن و هەستونەست و ناخمـان ئەتاسێنن ، یـا ئـەو شەیتانەی لە ژێر پەردەی تاریکیی شەودا کارارا دەبێ و نێچیرەکانی خـۆی ئەخاتە داوە پیسەکانیەوە ، یا ئەو ئارەزوە نزمانەی کاتی تەنیایی و تاریکی ئـەوروژێ و هەڵپـەی دامرکانەوەیـەتی .. کـە ئـەبێ پـەنا بـەخوای گـەورەمان بگرین بۆ پاراستنمان لە زیان و بەدویستی ئەو دیاردانە هەمووی .

﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴾ .. هـەروەها لـە شـەڕو خراپـەکاری ئـەو جادوگەرانەی بە هەندێ جوڵەو فووکردن بە گوریس و شتی وادا چاوبەسـتی خـەڵکیی ئەکـەن و هـەڵیان ئەخـەڵتێنن و گـیرۆدەی گێلـی و مێـشك و دەرون تێکـدانیان ئەکـەن .. کـە سـیحرو جـادووش لـە ئەنجامـدا هـەر مـاڵوێرانی و خراپـەکاری و دووبـەرەکی لێدەکەوێتـەوەو بـەهیچ جۆرێـك توانـای گـۆڕینی رووداوەکانی ژیانی نیەو، ناتوانن ویست و ئیرادەی خـوای گـەورە بگـۆڕن و ئاڕاستەکانی وەرچەرخێنن ..

﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾ .. هەروەها پەنا بردنە بەر خوای پەروەردگار بۆ پاراسـتن لـە شـەڕو خراپـەی ئـەو کەسانەی چاوی پـیس ئەبڕنـە خـەڵکیی و حەسـوودیان پـێ ئەبـەن ، گـەر نـازو نیعمـەت و بەخشـشەکانی خـوای پـەروەردگاریان پێـوە ببیـنن ، چـاویان بـەرایی نایـەت ئـەو بەخشـشانە بـە

خـەڵكی تـرەوە ببیـنن تـەنها بەخۆیانـەوە نـەبێت . كـە لەوانەیـە زۆر جـار ئـەنجامی باشـی لێنەكەوێتـەوە ، بۆیـە پێویـستمان بـە پـەناگرتن بـە خـوای باڵادسـتەوە ئـەبێت بـۆ رزگـاربوون لـە ئەنجامـە خـراپ و نەگریـسەكانی ئـەو حەسوودوی و چاوپیسیە ..

* * *

**سورەتی ( الناس )**

**مەککیە .... شەش ئایەتە**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ) .. **خوای گەورە بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ : بڵێ من پەنا ئەبەمە بەر پەروەردگاری هەموو خەڵکیی .. کە خوای پەروەردگار هەر خۆی پەروەردگارە ، ئاراستەکارو پارێزەرو پەناگایە ..**

( مَلِكِ ٱلنَّاسِ ) .. **پەنا ئەبەمە بەر شای هەموو خەڵکیی .. هەرخۆی خاوەن دەسەلاتەو بەتواناو کارهەڵسوڕێنەرە ..**

( إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ) .. **پەنا ئەبەمە بەر خوای هەموو خەڵکیی .. ئەو خواوەندە پەروەردگارە هەرخۆی بەهێزو بڵندو بالادەستە ..**

( مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ) .. **پەنا دەبەم لە شەڕو خراپەی بەدکارێکی دڵەڕاوکێ دروستکەری نادیارو دزەکەری ترسنۆك ..**

( ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ) .. **ئەوەی کە وەسوەسەو دڵەڕاوکێ و شکوگومان ئەخاتە نێو دڵودەرونی خەڵکیەوە ..**

( مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ) .. **جا ئەو خەڵکانە ئادەمیزاد بن یاخود جنۆکەکان بن .. یانی لە هەمان کاتدا توانای لە خشتەبردنی هەردووکیانی هەیە ..**

**خوای گەورە ـ لەم سورەتە کورتەدا بەبەخشندەیی خۆی ـ پێغەمبەرو نەتەوەکەشی ئاراستە ئەکات بەرەو پەنابردنە بەر خوای خۆیان ، تا**

بیانپارێزێت لە بەدکاری و بەدویستیەکی زۆر نهێنی و زۆر بێدەنگ ، وە گەر یارمەتی لەو پەروەردگارە بالأدەست و خواوەندە بەتوانایە وەرنەگرن هەرگیز خۆیان پیێ ناپارێزرێت ، چونکە ئەو بەدکارە نادیارە لە باریکە رێیەکی واوە دێت کە هەستی پێناکریێ و حسابیان بۆنەکردوە ..( الوسواس ) ، وەسوەسە دەنگێکی زۆر پەنهان ونهێنیە .. ( الخناس ) ، ئەوکەسەیە کە لە سروشت و ئاکاریدا ترس و پاشەکشێکردن ئەبینریێ ..

دەرونیش کاتیێ ئەزانیێ هێزێکی نادیارو پاشەکشکار وا دڵودەرونی مرۆڤ تووشی دوودڵی و فریودان دەکات . بەنهێنی و نائاشکرایی ، کەدەزانیێ ئەو هێزە یاهێزی جنۆکەیی شارەوەیە . یاخود کەسانێکن وەك شێوازی ئەو جنۆکانە خۆیان دەخزێننە دڵودەرونی مرۆڤەوەو هەروەك شێوازی ئەو جنۆکە شەیتانانەش تووشی دڵەڕاوکێیان ئەکەن . وە ئەزانێت لەکویێ خۆیان شاردۆتەوەو بەچ رێگایەکدا دەیانەویێ تێپەڕبن . کاتیێ کە ئەمە ئەزانێت ئەوکاتە خۆی ئامادە ئەکات و هەوڵئەدات خۆی لە زیانیان بپارێزێت ...

ئێمەی مرۆڤ دوودڵی دروستکردن بەهۆی جنۆکەکانەوە نازانین چۆن ئەنجام ئەدریێ و چ شێوازێك بەکاردێنن ، بەلأم کاریگەریەکانیان لەناو دڵودەرون و ژیانی رۆژانەماندا بەدی دەکەین و هەستیان پیێ ئەکەین ، وە ئەشزانین کە جەنگی نێوان ئادەم و ئیبلیس زۆر کۆن و دێرینە ، وە شەیتان خۆی بە ئاشکرا رایگەیاندوە ، بەهۆی ئەو خۆبەگەورەزانین و دڵرەقی و حەسوودیەی کە بەرامبەر یەکەمین مرۆڤ نواندی .. خوای پەروەردگاریش لەو گۆڕەپانی جەنگەدا هەروا مرۆڤی بیێ چەك و بێدەسەلأت بەجیێ نەهێشتوە ، بەڵکو پرچەك و توێشووی کردوە ..

ئەوەبوو ئیمان و بیروباوەڕی پتەوی کردە پەرژینێك بۆی و یادکردنەوەی خوای بۆ کردە توێشوویو پەنابردنەبەر هێزی خوای گەورەی بۆکردە چەك وتەقەمەنی دەستی .. وە هەرکاتێکیش مرۆڤ ئاگای لەو پەرژین و توێشوو چەکەی نەما ئەوە ئەبێ تەنها هەر سەرزەنشتی خودی خۆی بکات ..!

بەلاّم ئێمە زۆرشت ئەزانین دەربارەی شێوازی فێڵ و دڵەڕاوکێ دروستکردن لەلایەن مرۆڤ وئادەمیزاد خۆیەوە ، ئەشزانین کە لەزۆر خراپەکاریاندا توندترو دڕندە ترن لە شەیتانەکان !

ـ وەك برادەرێکی خراپ کە خراپەویستی ئەخزێنێتە ناو دڵودەرون و مێشکی برادەرەکەیەوە بەبێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێت . چونکە ئەو هەرگیز وای دانەنابوو لە رێی ئەو برادەرەیەوە تووشی کارێکی ئاوا نابەجێ ببێت !

ـ وەك کاربەدەستانی خراپەکار کە ئەوەندە بەگوێی فەرمانڕەواو سەرکردەکانیاندا ئەڵێن و ئەڵێنەوە تا ئەیانکەنە ملهوڕو ستەمکارو زۆردارو بەدکار لەسەرزەویدا !

ـ وەك کەسێکی دووزمانی شەڕەنگێز کە بەقسەی لوس و گەورەی وتە درۆو هەڵبەستراوەکانی خۆی وا شیرین و رازاوە ئەکات کە بەرامبەرەکەی چەواشە ئەبێ و گومانی نامێنێ و لای ئەبێتە هەق و راستی !

ـ یاخود ئەوانەی بازرگانی بەهەواو ئارەزوەکانەوە ئەکەن و لە رێچکەی ئارەزوە نزمەکانەوە دزە دەکەن و وا خۆیان ئەخزێننە ناو دڵودەرونەوە گەر بێداری و ئاگالەخۆبوون و یارمەتی خوای پەروەردگار نەبێت دوورناخرێنەوەو لێیان قوتارنابین ..

ـ وە دەیەها جۆری تریش لەو خراپەکارو بەدویستانەی بەنهێنی کارەکانیان ئەنجام ئەدەن و لەدەرگاو پەنجەرە نهێنیەکانی دڵ و مێشکەوە

خۆیان ئەکەن بەژووردا ..!

خۆ مرۆڤیش بەتەنیا ناتوانێ بەرامبەر ئەم هەموو دڵەڕاوکێ و بەدکاریانە رابوەستێ .. بۆیە خوای بەخشندە ڕێی پیشانداوەو ئاڕاستەی ئەکات بەرەو خۆپاراستن و پەرژین دروستکردن و توێشووهەڵگرتن و چەك بەکارهێنان لەو جەنگە سەخت و پڕمەترسیەدا .

وە ئاشکراشە کەتەنها یەکجار بێداری و بەئاگاهاتنەوە بەس نیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو شەیتانە نەگریسانە ، بەڵکو ئەبێ بەردەوام بێدارو ئاگامان لەخۆمان بێ ، چونکە ئەم بەرەنگاربوونەوەو ئەم جەنگە ساردبوونەوەی بۆ نیەو تا ڕۆژی قیامەت هەربەردەوامە و کۆتایی نایەت ..

* * *

# ناوەڕۆک

ژیان لە ژێر سێبەری قورئاندا بەهرەیە ، بەهرەیەکە ئەوەی نەی چێشتبێت نایزانێ ، بەهرەیەکە تەمەن بڵندو خاوێن و پیرۆز دەکاتەوە. سوپاس بۆ خوای گەورە کە وای بۆ رەخساندم ماوەیەك لە ژێر سێبەری قورئاندا بژیم .. لەو ماوەیەدا ئەوەندەی من تام وچێژم لە نیعمەت و بەهرەکانی خوای پەروەردگار وەرگرت هەرگیز لەژیانمدا بەو جۆرە ئەو چێژەم لێوەرنەگرتبوو . لەو ماوەیەدا گوێم لە خوای باڵادەست ئەبوو کە چۆن بەم قورئانە لەگەڵمدا ئەدوا ..
منی بەندەیەکی لاوازو بێدەسەڵات .. ! ئای ئەوە چ رێزلێنان و بەها بەخشینێکە بەم مرۆڤە ؟ چ پیرۆزیەکە بۆ تەمەن و بۆ ژیان؟

سەید قوتب

**لە بڵاوکراوەکانی**
**کتێبخانەی مەحوی**

دیزاین
نورالدين عبدالله